# چیمەن وچیا

## دیوانی شێعری

سە یید عە بدولقادر سە یادەت

موتە خە لیس بە سە یید

فارسی _ کوردی

# بسم الله الرحمن الرحیم



قەت نەبوو شێعر و ئەدەب دەردێکی دڵ دەرمان بکا

خەزنە خۆ وێرانەکەی خۆی ئاوەدان ناکاتەوە

سەید



ناوی کتێب: چیمەن و چیا
شاعیر: سەید عەبدولقادر سەیادەت
بڵاوکەرەوە: ناوەندی بڵاوکردنەوەی فەرهەنگ و ئەدەبی کوردی
«ئینتشاراتی سەلاحەدینی ئەیووبی»
تیراژ: ۲۰۰۰
چاپی یەکەم: ساڵی ۱۳۷۶ی هەتاوی

# پێڕست

## اشعار فارسی سید:

# چولە چرا

بە عەهدی خۆم ئەمن شەرتت بێ وەفاکەم    دەبا بەر بێ وەفا بێ ئاشناکەم
ئەگەر ڕۆژم ئەبو کەس ئاشنام نین    هەمو ئاشنان کاکە و براکەم
کەسێکی ئی عەبام ناخاتە سەرشان    ئەگەر توزێ دڕا شانی کەواکەم
ئەوەی وەک کوی دەبینی کا یە گشتی    کە بیم خەرمانەکەم کالی بە با کەم
لە بەر پەروانە دەورەم چول ئەبو قەت    هە ئاشوقیکلی بو چولە چراکەم
دەزانی چەندە چاک بوم من لە گەل دوست    کەچی ئێستا ئەخۆم چاکم ئە چاکەم
نەکو ئەو یارە کەرد بگریی دلی لێیم    دە بو گیانیش و مالیش فیداکەم
کەچی ئێستاکە هەر ئەو نابرایە    دەلی ئەم دیوی نات ناسم براکەم
دە لێیم تەرکی هەمو کەس کەم لە داخا    هەتا مەجبور ئەبم هەر بێیم وراکەم
لە ئاوی چاو ماغە رقم ئەلێیم چی    لە خۆم خنکاوترە خۆ ناخودا کەم
ئەگەر ڕۆژم ئەبو روی لێیم نیە کەس    سید، وەک ڕۆژ پەرستە ئاشناکەم

قەت نەبوو شێعر و ئەدەب دەردێکی دڵ دەرمان بکا
خەزنە خۆ وێرانەکەی خۆی ئـاوەدان نـاکـاتەوە
«سیــــد»

## به ناوی خودا

تـاوێک لێکـدانـەوە و بـەراورد کـردنی دیـوانـی سـەید عـەبدولقادری سیادەت (موتەخەلیس) بە کاک سـەید بـە هـۆی گـرنگی بـابەتەکـانی ئـەم دیـوانـە نـموونەیەک لێکۆڵینەوەی هەر دوو بەشی کوردی و فارسی‌یەکەی وەبەر چاو دەخەین .

ئـەم شـێعرانـە بـە تـێکڕایـی روبـاعی، دوو بـەیتی ، غـەزەل ، قـەتعە، قـەسیدە، موخەممەس، فەرد و ..... دەستی باڵایان هەیە لە وریا کردنەوەی ئەدیب و خوێندەوار.

بابەتی هێندی لە مەبەستی شێعرەکانی بریتین لە باسی هونەر و عـیلم و زانست و ئەدەب، وەرزێری و ئابووری ، دڵداری ، پیاهەڵدان ، لاواندن ( عـیرفان و تـەسەووف ، دیانەت)، سروشت ، بیری وڵات ، وەسفی بەهار، لە خودا پاڕانەوە و ستایشی ( حەزرەتی رەسوول (ص) ، تەنگ و چەڵەمە و گیرەکانی خەڵک و بە تایبەت رەنجکێشان و هێندی شێعریش بۆ شەوچەلەی دۆستان و ئاشنایانە .

شێعرەکانی تینێکی باش دەدەن بە گیان و گڕی دەروون بە هـۆی ئـەوە کـە لەگـەڵ راستی هەست و سەرچاوەی ئیلهام و سروشت پێوەندی‌یان هەیە . هێندێ لە شێعرەکان غەزەلن و پەپوولەی دڵداران بە دەوریاندا باڵ لێدەدەن، بە چاو تەماشای دەکەن و بە زبان دەیلێن و بە دڵ پێوە دەبن، وەک دەستە شێعری تەناف کە شێعری هەوەڵی ئەوەیە :

**لەو هەموو زولفە رەشەی تۆبەسە تەنیا داوێ**

**بۆ مەلی بێ پەڕ و پۆی دڵ کـە تـەنافی نـاوێ**

لە چـەن شـێعرێکی دەردەکـەوێ کـە لە تـەمەنی رابـردووی خـۆیدا بـە شـارەزایـی و کارامەیی‌یەوە تاڵ و سوێری زۆر چێشتووە و بواری تاقی کردۆتەوە و لە بارەی فەرهەنگ و ئابووری و قازانج و زەرەری جۆر بە جۆری خەڵک و جیاوازی چینایەتی لە نێویاندا تەجرەبەی وەرگرتووە و شێعرەکانی کردۆتە ئاوێنە بۆ دیتنی زۆر مەبەست لە نیو قەڕنی ئاخردا و وێنەی دڵ پڕ لە پەرۆش و داخی خۆشی لە بابەت هێندێ شتی ناحەزکە دیویە،

تێیدا دیارە و هەروەها خۆشحاڵیشی لە پیرۆزی و سەرکەوتنی مرۆڤ لە نێویاندا دەبینرێ کە دەڵێ :

**بە تهران مردمان صاحب علم و هنر دیدم**
**کز اینان ملک ایران سربلند و مفتخر دیدم**
**اگرچه شهر تهران مظهر نور و صفا باشد**
**ولی بس تیرگی را در میانش مستتر دیدم**
**بزیر آن عمارت کاسمانش زیر پا دارد**
**هزاران بی کلاه و کفش را از پا و سر دیدم**
**بهر جا خستۀ نالان یتیمی بی نوا گریان**
**زسوزش آتشم برجان زاشکش دیدەتر دیدم**

لە کاتی خوێندنەوەی شێعرەکان دەبینرێ ئەم دیوانە رووبارێکی سەرسام ئاوەرە و باس و بیر و رایە جۆر بە جۆرەکانی هەر یەکە جۆگەیەکی زانست و پێویستی زۆرە،

جاری وا بووە کاک سەیید تەماشای دەور و بەری خۆی کردووە و بەرگی مێژووی هەڵداوەتەوە بۆ ئەوە بزانێ لە هەوەڵەوە خانووی ئینسان لە کوێ بووە و چۆن لە غارەوە گەیشتەکورەی مانگ و ئەستێرە بەرزەکان.جاکەوتۆتە فکری ئایەی :

(( هل یستوی الذین یعلمون والذین لایعلمون)) و لەو رووەوە بۆی روون بووە کە خوێندەواری سەرفەرازی و سەربەرزی تێدایە و هیچ ئینسان وگەلێک بە پلەی بەرز و مەرام ناگات و ناتوانێ باڵ لێدا بە سەر زەوی و دەریا وکوراتی ئاسماندا مەگەر بە هۆی عیلم و زانستەوە.

**بال دانش گر نباشد فکر را پرواز نیست**
**شعله کی برخیزد از با یک دمی دمساز نیست**
**گرچە دانشگاه بسیار است در عالم ولی**
**همچون دانشگاه اسلامی که انسان ساز نیست**

جارێکیش لە تەلان و بەرباڵ و دەشت و مەزرا و جووت وگاو تراکتۆر وکمپانی ورد

بۆتەوە و ئایەی :((افرایتم ما تحرثون اانتم تزرعونه ام نحن الزارعون))ی وەبیر کەوتۆتەوە جا لێرەدا هۆشی داوەتە سەر باسی خەریک بوونی کاروباری ئابووری، سەنعەت و کەشاوەرزی کە مایەیی رابووردنیی باش و خۆشبەختی هەر گەلێک لە دنیادا و ئا لەو رووەوە جا بە زبانی شێعر ئەم مەبەستە گرینگە بە خەڵک را دەگەیەنێ کە من قازانجی خۆم لەو شوغڵەدا دەبینم بە هومێدی خودا و ئێوەیش بیری لێ بکەنەوە.

**بە هومێدی خودا و پێغەمبەر**
**گەر تەمەن مابێ رۆژێ دێتەوە باو**
**دەبمە جووتێری کشت و کاڵی زەوی**
**دەبمە وەرزێری دەست و پەل قەڵەشاو**
**دەستی ماندوو لە سەر زگی تێرم**
**دادەنێم جا دەڵێم براله سڵاو**

دیوانی کاک سەیید لە بارەی عیلمی بەلاغە و سەنایعی ئەدەبی‌یەوە لیپاولیپ و پڕە و بە شێوەیەکی رێکخراوی جوان و پتەو دارێژراوە و بە راستی لە شێعرە پێشکەوتووەکان دەژمێردرێن و لە دوارۆژدا رووناکبیرانی نەتەوەکەمان کەلکی زۆری لێ وەردەگرن ئەمە چەن نموونە:

مەجازی عەقڵی - لە مەسرەعی دووەم و حەقیقەتی عەقڵی لە مەسرەعی ئەوەڵ دا

**هست امید در این مرحله کز لطف خدا**
**گوشهٔ چشمی بما داشته باشد دوران**

مەجازی مورسەل - در سبزه و گل تسمیه سبب به اسم مسبب

**ابر رحمت چو ببارد بچمن سبزه و گل**
**خشک هرگز نشود از غضب باد خزان**

تەشبیە:

**من كە وەستاوم وەكوو كێوێک لەبەر دەرد و خەما**

**كێووكوێستان قەت سەری نابێ بە هەوروتەم نەبێ**

لەم شێعرەدا چەن تەشبیە هەیە:

١ - تەشبیەی موتلەق لە مەسرەعی هەوەل

٢ - تەشبیەی مەلفوفە دەرد و خەم هەر یەک موشبەهن و هەور و تەم موشبەبیهن.

٣ - تەشبیەی موجملە چونكە وەجهی شبهی لەو دا نەكوتراوە.

٤ - تەشبیەی مورسلە بە هۆی ئەوە كە ئەداتی تەشبیە لە رستەدا هەیە.

ئیستعارەی مەكینە:

**چەمەن خەملێوە كوێستان سەوزە دار هاتۆتە گوڵ كردن**

**بەهارە پێی بڵێن با ئاڵە كۆكیش پرچی هەڵپاچێ**

ئاڵە كۆک موشبە و چاو بە خومارێک موشبە بە قرتاو و پرچی هەڵپاچی قەرینە و لەم هۆنراوەدا سەنعەتی تجاهل العارفیش هەیە جوانیانی كە پەیوەندیان بە مەعناوە هەیە.

ئیهام:

**هەر كەسێ دەهات نانی دەدایە**

**هەر بە من نەدا سەی زادە خانم**

تجاهل عارف :

**چەمەن خەملێوە كوێستان سەوزە دار هاتۆتە گوڵ كردن**

**بەهارە پێی بڵێن با ئاڵە كۆكیش پرچی هەڵپاچێ**

جوانیانی كە پەیوندیان بە وشەوە هەیە.

تەزمین :

**یە هوی لا تەقنەطو من دڵنیا بووم**

**لە شک دانیم بە عەهدی تۆ وەفای تۆ**

له خـۆم نـەزدیک تـری بـۆ مـن بـڵێم چـی
چـــلۆن نـــاڵەی دڵم نـــاگـــاتە لای تـــۆ

تەجنیس :

شـــەویش بـــێ هـــەر دەڕۆم مـــن روو بـــە ئـــاسۆ
ئـــەگـــەر ئـــەستێرەیەک هـــەڵبێ لە ئـــاسۆم
ئـــەگـــەر رۆژم نـــەبوو رووی لیـــم نـــیە کـــەس
ســـــەیید وەک رۆژ پـــــەرستە ئـــاشناکـــەم

لە کۆتاییدا بە کورتی ئەوی شایانی باسە و پێویستە بکوترێ ئـەوەیە کـە لە بـارەی پێوەندی کۆمەڵایەتی‌یەوە بە هەست و بیر شـاعیرانـەی کـلاسیکی لەعـل و مـرواری و جەواهێراتی وشەی رەسەنی زبانی شیرینی ناوچەی مەهاباد، بۆکان، جمیان و تورجانی بە هەودای هەڵبەست هۆنیویەتەوە

کاک سەیید وشە و رستەی بەرز و جوانی لە قالب و چوارچێوەی شێعر خستووە و بە جەواهێراتی رەوانبێژی و سەنایعی ئەدەبی رازاندوویەتەوە بۆ ئەوە کە لەو قاب و دفرەدا ئاوی حەیاتی مەعانی بە کەلکی رزگاری و دروستکاری تێدا بدا بە دەست بێ بەشان و زەحمەتکێشان و لاوانی گەلی خۆی تا لە توونیەتی نەجاتی‌یان بێ و لە هەورازی ژیاندا بتوانن سەرکەون و بە خۆشی و تێر و پڕی و سەربڵندی بژین.

مەبەستێکی‌تر، حەقیقەت ئەوەیە ئەهلی فەن و زانا و ئەدیب بیر و بڕوایان وایە کە قەسیدە کامل و تەواو عەیار بە جۆرێکە تەشبە وتەخەلوس و شەریتەی تێدا چاوەدێری کرا بێ ئەوە نیشان دەدا کە هەر شاعیری لە پلەی هـونەری شـێعر و شـاعیریدا بـتوانـێ قەسیدەیەکی وا بێنێتە سەر کاغەز دەبێ بە ئەستێرەی پڕشنگداری ئـاسمانی ئـەدەبیات نێوی ببردرێ و قەسیدەی ئاوا کامل لە دیوانی کاک سەیید دا وەبەر چاو دەکەوێ وەکوو قەسیدەی بەهار کە هەوەڵ شێعرەکەی ئەمەیە:

بـــەهارەکـــاتی گـــوڵ وفـــەسڵی چـــوونی سـەحرایـــە
وڵات بـــــەهاری بـــــەهەشتە کـــــە جـــێی تـــەماشایە

وه هەر وەها کاک سەیید ئەگەر چی بەشی زۆری شێعرەکانی لە سەبکی کلاسیک دایە بەڵام وەبەر چاو دەکەوێ کە لەم راستایەش هەنگاوی زیاتر ناوە و دەتوانین بڵێین ئیبتکاری بە خەرج داوە و شێوەیەکی تازەی لە شێعردا بە کار هێناوە وەک شێعری گوڵی ئاوات کە مومکینە ببێتە رچە بۆ داهاتوو.

والسلام - محەممەد سەعید ئیبراهیمی

# پێشەکی

من کەسێک نیم کە بەسەرهات و سەرگوزەشتی من بۆ کەسانی دیکە جالیب و سرنج راکێش بێ، مەگەر بۆ ئەوانەی کە بە تایبەتی دەیانەوێ بزانن سەیید کێ‌یە و چی بە سەر هاتووە، رەنگە من بە سەرهاتی خۆم بۆ خۆم بنووسم باشتر بێ لەوەی کەسێکی دی بینووسێ. چونکە من خۆم باشتر دەناسم لە هەموو کەس و مەترسی ئەوەشم نیە کە ئەگەر دۆستێک بینووسێ و منی زۆر خۆش بوێ لەوەی کە هەم زیاترم هەڵکێشێ کە پێم نەگاتە عەرزی . یا خوا نەخواستە پێم بڵێ«مامۆستا»، چونکە بە راستی زۆر کەمترم لەوەی پێم بڵێن«ماموستا» مامۆستایی پلەیەکی زۆر بەرزە. شانی من بۆ ئەو عابایە نابێ. ئەگەرچی لە دێهاتە خۆشەکانی خۆمان بە هەر دارتاشێک، کە تەنیا بزانی نیر و ئامووری برا جووتیرەکان داکوتێ و دروست بکا، پێی دەڵێن مامۆستا!

من نێوم سەید عەبدولقادر، شۆرەتم سەیادەتە، کوڕی ناونجی مەرحوومی حاجی بابە شێخم ، لە ساڵی ۱۳۰۸ ی هەتاوی لە دی‌یەکی پڕدار و درەخت بە نێوی (جەمیان) کە لە مەڵبەندی تورجاندایە لە دایک بووم. تا تەمەنی هەشت نۆ ساڵی لەوێ بووم و لە پاشان ماڵمان چۆتە دێی تورجان. ئەوەی لەم تەمەنەدا بیستوومە، لێم دەگێڕنەوە و بۆ خۆشم بڕێکم لە بیرە، ئەوەیە: زۆر بزۆز و بە عەرزەوە نەوەستاو بووم. جارێک لاقێکم سووتاوە. بۆ ماوەیەک بە هەنگلۆشەلێ رۆشتبووم. لەوەوە پێیان کوتووم، تەیارە شکاو . نازانم کە ئەو وەختە نە تەیارەی ساغیان دیوە و نە شکاو یا هەر نێویان بیستووە، تەیارەی شکاویان

چۆن هاتوته بەر چاو و من چۆن لە تەیارەی شکاو چووم ؟!

لە مەدرەسەی علوومی دینی تورجان کە ئەو وەختە زانسگایەک بووە لە کوردستانا، دەستم کردووە بە خوێندن، چەند ساڵێک سوختەفەقێ بووم. لە پاشان کە بوومە موستەعید لە خزمەت باوکم و لە خزمەت چەند مامۆستای بە ناوبانگی دێیەکە کە لە مەدرەسەی تورجان دەرسیان دەکوتەوە، دەرسم خوێندووە و لە دوای ساڵانێکی دی لە تاران لە خزمەت مامۆستای گەورە و بەرێز، جەنابی حاجی (شێخەلئیسلامی) کوردستانی کە ئەو سەردەمە مامۆستای دانشکەدەی مەعقوول و مەنقوول بوو لە تاران ئیجازەنامەی عیلمیم وەرگرتووە.

لە ماوەی لاویمدا کە زۆر هەڵدەسووڕام و هەدا دانم نەبوو، لاقی چەپەم تووشی نەخۆشی یەک هاتووە، چونکە دوکتۆرەکانی ئەو سەردەمە نەخۆشینەکەیان نەناسی تا دەرمانی بکەن، دوو سێ ساڵ هەر کەوتوو رەوتوو بووم. لە پاشان چوومە تەورێز، بەینێک موداوام کرد بە داخەوە لەوێش نەخۆشینەکەیان نەناسی و بە هەڵە چوون، پێیان وابوو لاقم لە جێ چووە. لە رووی ئەم فکرەوە دوکتۆر موجیری مەولەوی کە ئەو سەردەمە رەئیسی نەخۆشخانەی شێروخورشیدی ئەودەم بوو لەگەڵ پیاوێکی شکستەبەندی مەحەلی دێن و بێ هوشم دەکەن و بە خەیاڵی خۆیان لاقم دێننەوە جێی خۆی. بەڵام بۆ بەدبەختی من بەشێکی جومگەی لاقم دەشکێنن و بە جارێک گردەنشینیان کردم. ئەم بە هەڵە چوونی موعالەجەیە بوو بە هۆی ئەوەی کە چەند جاری دی لە سەر لاقم عەمەلی جەراحی بکرێ و جار لەگەڵ جار خراپتریان دەکرد تا لە ساڵی ٥٦ ی هەتاوی لە تاران بۆ ئاخرین جار لە بیمارستانی ئاریا عەمەلیان کردەوە، لە دوای ئەم عەمەلە ئێستا، کەمێ باشترم. بەم بەمجۆرە ئەگەر بیخەمەوە سەر یەک زیاتر لە پازدە ساڵ باشترین و بە نرخترین تەمەنی جوانیم لە نەخۆشخانان دا رابواردووە و لە بەر ئەوەی کە لەم مەودایەدا گردەنشین بووم و جم و جۆڵم کەمتر بووە تووشی نەخۆشینی دیکەش هاتووم کە بە بەر نەخۆشی لاقمەوە داو و دەرمانم کردوون و تا ئێستاش هەر دەیکەم. بەڵام بەختەوەرانە تووشی نەخۆشی واگیردار واتە ( لێگرتنەوە) نەبووم کە لەبەر چاوان ببێزێم. لەم تەمەنەدا کە نەخۆش و دەردەدار بووم، سەرەڕای ئەوەش تووشی تەنگ و چەڵەمەی زۆر و مەترسی گیانیش

هاتووم که لازم ناکا سەری ئێوەی پێوە بێشینم .

ماوەی پیریشم ئەمەیە کە هەمە. بەشی زۆری ناخۆشیەکانی کاتی جوانیم هەر ماوە و دەردی پیریشی لێ زیاد بووە بەڵکە شتێکیش زیاترە ئەویش ئەوەیە کە لەم ساڵانی دواییدا لەگەڵ چەند هاورێ تووشی زیندان و مەیدانیش هاتم کە ئێستا و ئێستاش نە من زانیم و نە کەس زانی کە هۆی ئەم زیندان و مەیدانەم چ بووە .

لە دەورانی ناخۆشینەکانمدا ژنم هێناوە یان باشتر بلێم ژنیان بۆ هێناوم. بەم کارە باریان لێ قورستر کردووم و کردمیانە بارەبەرو بەرێوە بەری ماڵ و منداڵێش. بەم جۆرە زەحمەتی بە خێو کردنی ماڵ و منداڵێش بوو بە ریشەوە کە ئێستا ریشم بە تەواوی نەهاتووە .

بەم جۆرە تەمەنی لاویم رۆیوە و تەنیا بیرەوەری‌یەکی تاڵ و دڵتەزێنم بۆ ماوەتەوە ئەو وەختە کوتوومە :

**بـــا درد و غـــم عـمر جـوانـی گـذرد**

**یـا رب نشـود چـو مـن جـوانـی نـاکـام**

**ایـــن است در ایـــام جـــوانـــی حـالم**

**تـــا چـــون گـــذرد بـدرد پـیری ایـام**

ئێستا لە دوای سی و چەند ساڵ کە ئەو شێعرەم کوتووە دەڵێم براله خراپ دەگوزەرێ لە مەو لاوەش نازانم چۆن دەبێ . ئەو هەموو مەینەت و چارەرەشی‌یە بۆتە هۆی ئەوەی نەمتوانیوە هەڵبەستەکانم بە جوانی کۆ کەمەوە بەشی زۆری ئەو سەردەمە کوتوومە لە ناو چووە.

لە بیرمە رەفیقە فەقێکانم و دۆستەکانم ئەوانەی کە ئەهلی زەوق بوون و شێعریان پێخوش بوو دەهاتنە لام و دەیانگوت: تاگۆڕ بە گوڕ نەبووی چی تازەت کوتووە بماندەیە. منیش کە درێخم لێ نەدەکردن بەڵام ئەو وەختە نە من عەقڵێ ئەوەم هەبوو نوسخەیەک لە شێعرەکە بۆ خۆم رابگرم، نە ئەوان ئینسافی ئەوەیان هەبوو روونووسی بکەن و نووسراوەکەم بدەنەوە. بەو جۆرە زوربەی شێعر و هەڵبەستەکانم لە ناو چوون. لەوانە تا ئێستا چەند هەڵبەستێکم دەست کەوتۆتەوە، چەند شێعرێک لەوانە برای ئازیزم کاک

(نەجمەدین ئەنیسی) لە نێو دیوانەکەی جەنابی گەورەم (سەید کامیلی ئیمامی) کە خەریکی رێک و پێک کردنیان و چاپ کردنیان بوو بەرچاوی هاتبوو، مالێ ئاوا ، نوسخەیەکی لەوانە دامەوە. ئەمەش بڵێین ئەو شێعرانە کە کەوتبوونە دەست مامۆستا ئاوات لە بەر باشی شێعرەکان نەبووە کە راگیرابوون، لە بەر ئەوە بووکە ئەو پیاوە گەورەیە منی خۆش دەویست و زۆریش بە بیر و هۆش بوو. وەکوو دەڵێن گیا هەر بە جێی سەختەوە دەمێنێ .

شێعر کوتن هەمیشە بۆ من بۆتە هۆی دەردی سەری و تەنگ و چەڵەمە . چونکە بەشی زۆریان ئینتیقادی، ئیجتیماعی بوون و لە ئاکارێکی دژی کۆمەڵ بوو بێ بە جۆرێک رەخنەم لێگرتووە. جا ئەوانەی مەبەستەکە پێی ئەوانی گرتۆتەوە لێم رەنجاون و لە هەر فرسەتێکدا بۆیان هەڵکەوتبێ هەولیان داوە کۆسپێک بخەنە سەر رێم .

بۆ وێنە هەوەڵ جار کە بۆ موعالەجە چوومە تاران و تارانم لە پێشدا نەدیبوو، شارێکی گەورە و خۆشم هاتە بەرچاو. چەند رۆژێک کە تێیدا مامەوە زانیم ئەو شارە بۆ زوربەی دانیشتوانی ناخۆشی زۆرترە لە خۆشی، و لە بن دیواری ئەو کۆشکە گەورانەدا هەزاران رووت و قووت و پێخواس و هەناسە ساردی لێ کەوتووە و کەس نیە دەردێکیان دەرمان بکا . ئەمە بوو بە هۆی ئەوە شێعرێکم کوت و وام لە بیرە دام بە گۆواری (امید ایران) کە ئەو سەردەمە لە تاران دەردەچوو. یەکێ لە بەیتەکانی ئەمە بوو:

**بزیر آن عمارت کاسمانش زیر پا دارد**

**هزاران بی کلاه و کفش را از پا و سر دیدم**

ئەم شێعرە کاتێ لە گۆوارەکەدا چاپ و بلاو بۆوە، وا دیار بوو لە ئەفکاری عوومی ئەو سەردەمەی دانیشتوانی تاراندا شوێنی زۆری هەبووە و بە دڵخوازی خۆیان مانایان لێداوەتەوە ، ئەوەش بە جیا بوو بە هۆی گرفتاری و نارەحەتی‌یەکی زۆر بۆ من .

من هەر لە تاران بووم، لە نەخۆشخانەی (دوکتور عەبدوللا واسیعی) کە ئەو دەمە لە شەقامی ژالە بووکەوتبووم و لاقم لەگەچ گیرا بوو. پیاوەکانی ساواک بە شوێنمدا هاتن و لە دوای لێپرسین و بازجوویی‌یەکی زۆر بە تکای دوکتور واسیعی ئەوکاتە دەستیان لێ هەڵگرتم . بەلام لە پاشان بۆ ماوەی چەند ساڵ هەر بە دوامەوە بوون و سەریان لە سەر

هەڵنەدەگرتم، تا خوا لە ناوی بردن .

لەگەڵ ئەم هەموو نەخۆشی و تەنگ و چەڵەمەیە بەینا بەین هەر دەمخوێند و موتاڵام دەکرد، بەڵام چونکە خوێندن و موتاڵاکەم تەگەرەی زۆر تێدەکەوت، دەبێ بڵێم زۆرم خوێند و کەم فێر بووم.

هەر لەو هەوەڵێ لاوی و فەقێیەتی‌یەوە ، عەلاقەم بە شێعر و ئەدەبیات زۆر بوو شێعری حافیز و سەعدیم دەخوێندەوە. ئەگەرچی کەمتر لە مانایان حاڵی دەبووم، بەڵام عاشقی شێعری نالی و مەحوی بووم. بە زەحمەتێکی زۆر ئەم وەختە دیوانەکەیانم وەدەست هێنا لە هەر فرسەتێکدا بە دزی و فزی لەکون و کاژێران دەمخوێندەوە و چونکە بە زمانی خۆم بوون پێم خۆش بوون و لە ماناشیان دەگەیشتم.

ئێستا خەریکم ئەوانەی کوتوومن لەکۆن و تازە خڕیان کەمەوە. ئەگەر بەخت یاریم بکا لە چاپیان بدەم. ئەگەر ئەمجاریش لێم لە ناو نەچن ، چونکە جارێکی دیش بەشێکی زۆر لەو هەڵبەستانە و هێندێ کتێب و پەڕتووکی دیشم کە زۆر لە لام بە نرخ بوون بە تەرەف چون. دەسەڵاتم نەبوو برێکیان بۆگریام و کوتم :

**خەرمانەکەم کە رۆیی بە سێڵاوی حادیسات**

**ئێستاکە خۆڵ وەسەر دەکەم و کا بە.با دەکەم**

ئێستا کە پیر و شکستم و تەیارەی ساغ و شکاویشم دیوە، دەزانم تەیارەی شکاو مانای چیە . شوغڵێ ئێستام سەردەفتەری‌یە و تەنیا وەسیلەی ژینی خۆم و ماڵ و منداڵەکانمە . خوا نەیبڕی باشە .

**مەهاباد سەیید عەبدولقادر سەیادەت ٦٤/٩/١٠**

# تاریفی پێغەمبەر

ئـەی داوەرەکـەی رۆژی جـەزا ئـەحمەدی مـوختار
ئـەی مەخزەنی ئەسراری خـودا سەروەر و سەردار
ئەی نـووری خـودا شـەمسی هـودا مـەزهەری لەولاک
پـەروانـەیی رووی تـۆیە هـەموو سـابت و سـەییار
تـــۆ مـــەتلەعی وا بـەدری مـونیرێکی بـە عـالەم
شـایستەیە بـۆت بـبیە هـەموو مـەتلەعی ئـەقمار
ئەی کـەعبە ئـەتۆ بـوتکەدەیەک بـووی و مـوحەممەد
تـــۆی کـــردە سـەفاخانەیی دڵ، قـیبلەیی ئـەحرار
ســـایەی نــەبووە خـۆ قـەد و بـاڵایی مـوحەممەد
مـەهتابە بـە روونـاکـیـیە سـایەی بـە شـەوی تـار
هـەر کـەس کـە لە ژێر سایەیی تۆ دا بێ خـەلیلە
چـــارەی چـیە ئـاور کـە نـەبێتە گـوڵ و ئـەزهار
بـــەحری کـــەرەمی تـۆ نـەبێ غـەرقم لە گـوناها
نـــایشواتـــەوە گـــریانی مـن و جـۆششی جـۆبار
بـــەم بـــاری گـــوناهانەوە هـــاتوومەوە دەرگـات
تـــرسم نـیە گـەر رۆژی جـەزا تـۆ بـی تکـا کـار
بـــۆ خـــزمەتت ئـــەمجارە دڵم نـاردووە قـوربان
تـــا کـــەنگێ خـــودا پـێمی دەدا نـۆبەتی دیـدار
بـۆنی پـەرە دەسـتێنێ وەکـوو مـیسکی مـوکەڕڕەر
نـێوت کـە دەبـا سـەییدی دڵ خـەستە بـە تـیکرار

# ئیسلام

ئیسلامە جیلوەکەی کە لە دڵدا بدا قەرار
ئاوێنەیی جەلا دەبێ قەت ناگرێ غوبار
وەک رۆژ بووە مەداری جیهان ئەوکەسەی کە بوو
دەورانی جاهیلی دڵەکەی رەش وەکوو دەوار
ئیسلام دەڵێ کە مافی من و تۆ وەکوو یەکە
تەقوایە ئیمتییاز و تەقەلایە ئیعتیبار
لەو دینەدا بە حوکمی عەداڵەت بەرابەرن
هەر میللەت و نەژاد و رەگەز عەشرەت و تەبار
هەر قودرەت و شکۆیە لە خزمەت گەلا نەبێ
بێ قەدر و بێ بەهایە وەکوو پووشی بێشەزار
ئیسلامی راستین ئەگەر ئەورۆ پیادە بێ
سوار و پیادە یەک دەکەون دەبنە هاوقەتار
سفرەیێکی پڕ غەزایە لە ئەرزایە راخراو
بێ بەش نیە لە خواردنی ئەو خوانە مووروومار
هەنگوێنی شیرنە کە بە تەبعی هەموو کەسە
بەو شەرتە تێکەڵاوی نەبووبێ لە مار ژار
لەو دینەدا میلاکی عەمەل کار و کۆششە
زاڵم زەلیلە زۆر نیە هەر موفتەخۆرە خوار
رۆژێ دەبێ نەمامی عەداڵەت چرۆ بکا
شین بێتەوە وەکوو لە بەهارا چڵی چنار
ئەو دارە ریشەدارە کە ئیسلامی پێدەڵێن
ئەو جۆرەیە شیاویە دوو بارە بێتە بار
سەیید هومێدی وایە کە کەم کەم بگاتە جێ
هەر چەندە خۆی پیادەیە یاران هەموو سوار

# جێژنی مەولوود

شەوی جێژنە و سەرم سەودائیییە و سەودا سەرم ئەوشۆ
ئەمن غەرقی سەفا و عیشقی رەسوولی سەروەرم ئەوشۆ
لەپێ کەوتووم و دەستیشم بە داوێنی حەرەم ناگا
لە بەختی خۆم برا تەیرێکی بێ باڵ وپەڕم ئەوشۆ
شەوی جێژنە و هەموو کەس هەڵدەگیرسێنێ شەمێک و من
لە سایەی ئاوری دڵ شەو چرای سەد ئەختەرم ئەوشۆ
دڵێ بەرژاو و فرمێسکی رژاوو جەرگی هەڵقرچاو
دەبێ فریام کەون زوو ببنە یار و یاوەرم ئەوشۆ
بە ئاوی زەمزەمیش حوکمی تەهارەت نادرێ بۆ من
مەگەر ئەشکی گەشی چاوم ببێتە داوەرم ئەوشۆ
شەوی جێژنە و بەڵام هیچم نیە بیکەم بە قوربانی
بەڵێ خۆم و دڵم بۆ گاوو گەردوون حازرن ئەوشۆ
برا رێگەی وەفام گرتۆتە پێش بارێم نەکا بێشم
لە رێی ئەودا دەبێ بڕوا لە باتی پێ سەرم ئەوشۆ
لە چاوما وێنەکەی زەوزە ئەگەر نەخشی نیە بۆ چی
لە هەر لایە دەبینم دێتەوە بەر مەنزەرم ئەوشۆ
نەسیم هەستە بڕۆ بۆو جێیە ماچکە مەقدەمی و بێژە
لە لایەن سەیدەوە من قاسیدی نامەبەرم ئەوشۆ

# روو لە خوداکە

تـــۆزی حـەسەد و کـینە لە رووی سـینە جـیا کـە
بـــەم ویـــنەیە ئـــاوێنەیی دڵ کـــاکـە جـەلا کـە
وەک سەرو ئـەگـەر بـەرگ و بـەرێکت نـیە بـۆ کـەس
بــێ پـێچ و پـەنا راست و رەوان روو لە سـەماکـە
دڵ رەش مـەبە بـوغزی ئـەم و ئەو مـەگـرە لە دڵدا
وەک بـاخی بــەهەشتە دڵی بــێ کـینە بـراکـە
ئەو عەهدە کە بەستووتە لەگەڵ خۆت و خودای خۆت
سـەد جـار کـە شکـاندووتە یـەکـەم جـارە وەفـاکـە
گـەر چـاکـە بـرا خـزمەتی ئـەم خـەلقی خـودایـە
خۆت خەلقی خودای چاکە لەگـەڵ خـۆت بکـە چـاکـە
داوێـــن مـەتەکـێنە لە بـەر ئـەسرینی دوو چـاوم
هەر چەندە بە خـوێن سـوورە بـەڵام گـەوهەری پـاکـە
دنـــیا کـە شکـاندی دڵەکـەم پشـتی لە مـن کـرد
بـۆ جـەبری هـەموو کـەسری سـەید روو لە خـودا کـە

# تیکراری نوور

وەک ڕۆژی ڕوونە شەو مەه و ئەختەر موحەممەدە
تیکراری نوورە یا خۆ موکەڕڕەر موحەممەدە
ئەو کەهکەشانی نوورە کە دەخولێنەوە هەموو
لەو نێوەدا مەداری مونەوەر موحەممەدە
بەو نوورە لاچوو پەردەیی زوڵمەت لە سەر دڵان
ئەمشۆ تلووعی مەزهەری ئەنوەر موحەممەدە
ئەو نوورە وا قەوامی بەشەر پێی دەبێ قەوی
ئیسلامی ڕاستینە کە ڕابەر موحەممەدە
بۆ (ئینتیزامی) عالەمی هەستی زەروورەتە
نوقتێکی ئیتیکا کە موقەدەر موحەممەدە
پێغەمبەران ئەگەرچی وەکوو سەنگی قیمەتین
سەنگین ترە لەوان وەکوو گەوهەر موحەممەدە
ئەو حەلقەیەی مەداری نیزامی لە سەر سەرە
لەودا نگینی خاتەمی ئاخر موحەممەدە
بێ یار و یاوەرم ئەگەر ئەوڕۆ لە سەر زەوی
جێی غەم نیە کە یارم و یاوەر موحەممەدە
سەیید مەترسە گەرچی بە باری گوناهەوەی
لەو دادگای عەداڵەتە داوەر موحەممەدە

# پاڕانەوە

خودا چ بڵێم لە وەسفت دا وەهای تۆ
بە هەرچیت من بشوبهێنم جیای تۆ
لەگەر هەر زەڕڕەیەکدا تێکەڵاوە
ئیرادە و قودرەت و خەلق و بەقای تۆ
هەموو مەدحت دەکەن هەریەک بەجۆرێ
ئەوی مەوجوود لەسەر ئەرز و سەمای تۆ
بەڵام قەت ناگەنە چۆنی سورشتت
کە دەریای بێ بنە جیلوە و جەلای تۆ
لەوە زیاتر لە مەدحتدا بڵێم چی
کە من مەخلووقی تۆم یارەب خودای تۆ
نەئیشێک بێ ئیشارەت دێتە بەر لەش
نەهیچ دەردێک شفای دێ بێ دەوای تۆ
ئەگەر دەرد وبەڵات پێخۆشە بۆمن
لەگیانی من کەوێ دەرد وبەڵای تۆ
بەهۆی (لاتقنطوا) من دڵنیا بووم
لەشک دا نیم بەعەهدی تۆو وەفای تۆ
من وباری گوناهانێ و خەتای زۆر
ئەتۆ و دەریایی بەخشین و عەتای تۆ
بەلێ باری گرانە سووچ و تاوان
بەڵام لێبووردنم هاسانە لای تۆ

خـــودا رەحـــمی بکـــەی بـۆ دڵ پـەشیوان
هــــەموو هـاتوونە ژێـر سـایە و پـەنای تـۆ
لە ئـــاسۆی بـــەرزی ســـەبرم تـــێپەڕیوە
سکـــاڵایە دەکـــەم بـــۆ بـــارەگـــای تـــۆ
بـە قـەترێک شـین دەبـێ تـۆوی تـەمەننام
لە دەریـــای رەحـــمەتی بـێ ئـینتیهای تـۆ
بـــە تـــۆفانی ژیـــان کـــەشتی شکـــاوم
لە هـــەر گـــێژاوەیـــەک دا نـــاخودای تـۆ
بـــــرینداره دڵی شـــــەو زیـــــندەداران
هــــەناسەی ســـاردیان گـــەییە لەقـای تـۆ
لە خـۆم نـەزدیک تـری بـۆ مـن بڵێم چـی
چـــلۆن نـــاڵەی دڵم نـــاگـــاتە لای تـــۆ
شـەوی رەش پـەردەکـەی لاچێ لە سەرمان
ســـــبەینیمان بگـــاتە شـــەوچرای تـــۆ
لەوە زیـــاتر قـــەڵەم یـــاری نـــەکـــردم
بـــە سـەیید نـاکـرێ حـەمد و سـەنای تـۆ

## بە یادی وڵات

کـــــەوتەوە بـــیرم یـــادی وڵاتـــم
یـــانەی ئـــامانجم جـێگەی ئـاواتـم
ســـروەی نـــەسیمی هـــۆی هـاناومە
تـۆزێک لەو خـاکـە سورمەی چاومە
وەتـــەن ئـــەی جـێگەی راز و نـیازم
سەر بـەرزییەکـەی تـۆ لە خـوا ئـەخوازم
دنـــیای رابـــوردووم ئـەهاتە بـەرچـاو
مـەوجی خـەیاڵات وەک شـەپۆلی ئـاو
لەرێـــدا لامـــدا مـــاڵی بـــوداقـــی
لە بـــنەماڵی کـــۆن ئـاسارێک بـاقی
قـــەڵای قـــەدیمی چـــۆڵ و ویـرانـە
«کـــونده بـــوو تـیێدا کـردوویە لانـە»
چـــاوم روون بـــۆوە دڵم گـــەشاوە
کە دیم دۆستەکـەم سـەر زیـندوو مـاوە
پـــیاوی بـــنەماڵە بشـــبێ ئـــاوارە
نـــەجابەت هـــەروا لە سـیمای دیـارە
یـــاخوا بـــنەماڵ نـــەکـــەویە زەوی
جـــەوری زەمـانە نـەتکا سـەر نـەوی

## ئـاوایی تورجـان

کەوتمە رێ و رۆیم بەرەو رووی تورجان
ســـەرم ســـەودایـــی دڵم پـەرێشان
دەشت و کـەژ و کـێو سەوز و رەنگینە
دەڵێـی بـەهەشتی سـەر رووی زەمـینە

چیا هێند جوانە سەر سوڕ دەمێنێ
هەڵاڵە و بەیبوون با دەیشەکێنێ
لە قەراخ رێگا بەردی گەورە و زل
«کە چەرخی چەپگەرد پێی نەداوە تل»
لە کەنار جادە گیای شلک و کەوتوو
پێ پێ پێشێلی رێبوار و ماندوو
دڵ خەیاڵاوی دەروون پڕ لە خەم
نازانی رێگا زۆر رۆیوی یا کەم
ئاخر گەییشتمە نێو ئاوایی دێ
بەخەیاڵ بڕۆی رێ زوو دوایی دێ
کۆڵانەکانی پڕ لە پیر و جوان
شان دەسوێ لە بەر هاتۆچۆی ئینسان
کانی قۆنگرەش هەر وەک خۆی ماوە
سەرچاوەی ئاوی لێ نەشڵەقاوە
کچە تورجانیماڵیان بێ ئاوا
لە کانی رۆ ژیان لێ نابێ ئاوا
وەک ئاسکی کێوی بە جیلوە و جوانی
هەر لەوان جوانە هاتوچۆی کانی
دەچووە سەر کانی زۆر دەمایەوە
هەر گێژی ئەخوارد ئاو بەلایەوە
حەوشەی مزگەوتێ و بەردە نوێژەکان
بانک دەکا بۆ نوێژ پیاوی موسوڵمان
جەمات دانیشتوون لەو سەر بەردانە
نوێژی خوایان کرد بووە بەهانە

پیران لەگەڵ یەک جحێلان بە جوێ
هەر کەس بە هەوای دڵی خۆی ئەدوێ
پیران بە یادی رۆژی رابوردوو
لاوان بە فکری کاتی نەهاتوو
لە هەموو جۆرێک خەڵکی تێدا بوو
هەر مەلا و فەقێی تێدا نەمابوو
مەدرەسەی تورجان خۆی لە زەمانا
زانسگایەک بوو لە کوردستانا
مەدرەسەکانی چۆل و نائاوا
بریا کوێر بووبام نەمدیبا ئاوا
بەڵام سەد شوکر کاک عەبدولعەزیز
زانای ئایینی و مامۆستای ئازیز
بە هەر جۆر نەیهیشت چۆڵ بێ ئەو جێیە
شێخ و قزلجی هیوایان پێیە
هەر چەند ئەم چەرخە چەپ خولایەوە
بە خوێنی جەرگی ژیا و مایەوە
گەرچی زەمانە دەستی ویشی بەست
ئەو سەنگەری خۆی بەرنەدا لە دەست
تەنیا ئەستێرەی ئاسمان لەو ناوە
رووناکایەکی ببێ ئەو ماوە
گەوهەری دەریای عیلم و عیرفانە
دەبێ هەروا بێ جێگاکەی کانە
یاخوا بمێنێ تا دێر زەمانێ
هەر چەند زەمانە قەدری نازانێ

## ئاوایی قاقلاوا

چووومە قاقلاوا مالّی ئیمامی
دەردەدارێک چوو بۆ دەوای زامی
مامۆستای گەورە و بەرێز و زانا
وێنەی کەم ماوە لە موکریانا
ئەستێرە گەشەی بەری بەیانە
بە جێ ماوە لە رێی شەوی ژیانە
هەر چەن جێگاکەی چۆل و کەنارە
مانگ لە هەر لایەک هەلّبێ دیارە
ماوە لەو دێیە ئەو زانای نامی
قاقلاوا جامە و ئیمامیش جامی

## خانەقای زەنبیل

خانەقای زەنبیل جێی عیشق و ئاوات
بۆنی بەهەشتی خوای لێ ئەهات
کابەی ئامالّە ئەو بارەگایە
جێی راز و نیاز لەگەل خوایە
دەنگی تەهلیلەی سۆفی شەوانە
عەرشی خوایان دینا جۆلانە
لە خانەقادا گەلی دەروێشان
سەریان شۆریدە دلّیان پەرێشان
لە وەختی زیکرا دەروێش دلّ ریش
پرچی وەک دلّی پەرێشان دەروێش

دەروێش و سۆفی زوار و خۆیی
هەر کەس سەری خۆی هەڵگرت و رۆیی
ئەوەی بە وەفا و خاوەن کەرەم بوون
هەر کۆترەکانی دەورەی حەرەم بوون
ئەوانیش فڕین روو بە هەوا بوون
ئەوانیش وەک من سەر بە هەوا بوون
لە دۆستەکانی خوا کەس نەما
خوا خۆی ماوە بە تاقی تەنیا
چ جێیەک بچم دڵ لێی بە جێ بێ
من بچمە کوێ دی بۆنی وی لێ بێ

## ئاوایی جەمیان

چوومەوە جەمیان مەوتەنی کۆنە
تاکوو بزانم ئێستا چلۆنە
دەر و دۆڵ هەموو گوڵ و شینایی
پێی روون دەبۆوە هێزی بینایی
لە هەر لاخڕێ خوڕەی ئاوزوون
زەمزەمەی عیشقی لەیلێ بۆ مەجنوون
دیتم ناو دێکە وەک خۆی نەماوە
ماڵێک ئاوەدان ماڵێک کەلاوە
ئەو دێیەی باغات دەورەی لێدا بوو
وەک باغێک دەورەی پەرژین کرا بوو
باغ و دێ هەر دوو رووبە وێرانی
شوێنێک نەمابوو لە جیلوە و جوانی

یەکێ لە یاران یاری قەدیمی
دڵی گەشاوە ئەوساتەی دیمی
ئەمنی دی و کوتی دنیا هەر وایە
هەر رۆژە لە دەس خاوەنێ دایە
خەم مەخۆ دنیا زۆرتری ماوە
ئەمڕۆ کە دەڕوا سبەینێش باوە
هەموو ئاشنا ئەهلی ئاوایی
سەرخۆش و روو خۆش بە مەرحەبایی
بەعزێکیان نەبێ لە نێو واندا بوون
من نەمدەناسین لە ئاشناش دەچوون
لە پاشان زانیم ئەمانەی دەمدین
کوڕی ئەوانەن کە زوو دەمناسین
چوومە مزگەوتێ گشت لاخرا بوو
وەک ماڵەکەی من بێ خاوەن مابوو
بێ بانگ و سەڵا چۆڵ و ویرانە
بۆتە مەکۆگەی گورگی شەوانە
نەعوز و بیللا لەو رۆژ و کاتە
خوداش هەر وەک من بێ دەسەڵاتە
خودا ئەفەرموێ مزگەوت ئی منە
خۆم دەیپارێزم لە شەڕ و فیتنە
بەڵام کێوەکان هەروا گەردن کەش
«ئاسمانی شینیان گرتۆتە باوەش»
سەر لوتکەی کێوی عاسمان بو لاغی
هەروەک خۆی سەرکەش لە خودایاغی

رووتــە هـەر وەک خـۆی بـڵند و بـەرزە
بــە بـــای حــەوادیس نــایەتە لەرزە
رووتـەم پـۆشتە دی لە گـوڵ و سـەمەندا
هــەر دەڵێــی ســەروە لە نـێو چـەمەندا
هــــەر شت وەکــوو کـێو پـتەو بـمێنێ
جــــەوری زەمـــانە تــێکی نـاشکێنێ
بـــاغی بـــەرماڵان چـــۆڵ و ویـّـرانــە
کـــونده بــۆش نــاکــا تــێیدا هــێلانە
ئــەو بـاغەی چـاوی پـێ روون دەبـۆوە
هــەر دەبــوو گــوڵی بکــەی بــە بـۆوە
ئــێستا لەو هـــەموو گــوڵ و ســونبولە
وەدەس هـــێنانی گـــوڵێک مــوشکولە
هــــەر جــۆرە مـیوێک دڵ بـیویستایە
لەوێ بـوو ئـەگـەر لە ئـیرەم نـەبوایـە
دارە تـــووەکـــەی قـــەراخ ئـاوایـــی
وەک داری تـــووبا بـــە نـرخ و بـایی
ســـەر و لقشکـــا و کـــۆتەرەی مـاوە
ئـافـەت لێــی داوە لــە هـەمـوو لاوە
بـــەڵام ریشـــەکـەی لە دڵی ئـەرزایــە
بـــە زۆری ئافەت لە ریشــــە نـــایە
رۆژی دەیـــــبینی دەبـــــووژێتەوە
لق و پـــۆپەکـــەی شـــین دەبـێتەوە
دار یـاسەمەنی نـاو بـاخچەکـەی مــن
تـــەنیا ئـــەو مـابوو نـەهاتبوو لە بـن

ئەویش مام رەشید وەک ماڵی زەوتی
لە بەر خاتری خۆی پارازتوویەتی
ئەهلی ئاوایی مشت و مڕیانە
لە سەر لێفەکەی مەلا شەڕیانە
پیرە پیاوەکەی لە دەست و دووچوو
لە قەراخ باخی وەک کەلاک کەوتوو
هەناسەی سارد و دووکەڵی قلیان
وەک مژ لە سەری چین چین هەستان
ئەوەش نیشانەی جەوری زەمانە
رۆژی رەش ئێستاش ماویە نیشانە

# تەیارە شکاو

بە مندالّی دایە پیرێک     پیر و ژیرێک رۆشن بیرێک
بە خێوی کردم بە جوانی     تا نەمرد قەدرم نەزانی
هەزار زەحمەتی بۆ کێشام     هەزار مەینەتی بۆ چێشام
بە شەو هەتا مەلا بانگدان     شەونخوونی، هەدا نەدان
بە رۆژدا هەتا ئێوارە     خستمیە سەر دارە دارە
قسەی دەخستمە سەر زمان     تا زمانم گرت بە قسان
وردە وردە سەر پێ کەوتم     بۆ خۆم رۆیم و رێکەوتم
چل و فل و شێت و بێعار     دەس بریندار پێ بریندار
هەر ئەوەی برسیم نەبوایە     چم نەدەویست لەو دنیایە
لە پاشان لەگەلّ فەقێیان     لە حوجرەی شاران لە دێیان
دەرسم دەخوێند دادەنیشتم     زۆرم خوێند کەم تێگەییشتم
کۆترێکم بوو خونچیلانە     دەرم دێنا لە هێلانە
هێندم لە دار و بەرد دابوو     کۆتر بالّێکی شکا بوو
دایە پیرە بە قاوە قاو     لە دووم دەهات هەنگاو هەنگاو
پێی دەکوتم کۆتری بالّ قرتاو     توند مەڕۆ تەیارە شکاو
ئێستاش نەمزانی بە تەواو     چۆنی من هاتبووە بەرچاو
تەیارەی خۆ قەت نەدیبوو     هۆی ئەم نێو لێنانەی چی بوو
ئێستا کە زل بووم دەزانم     چۆن بە سەر دەچوو ژیانم
تا لاو بووم قەدرم نەزانی     سوودی چیە پەشیمانی
ئێستا کە زل بووم بوومە پیاو     پیاوێکی سەر بە خۆ و تەواو
بوومە هۆنەر بوومە نووسەر     بوومە خاوەن کتێب و دەفتەر
لاتان وایە زۆر تەواوم     نەک نیوە پیاو تەواو پیاوم

بەڵام نەخێر نەبوومە پیاو     پیاوێکی سەربە خۆ و تەواو
بوومە نۆکەری هەموو کەس     نۆکەری هەر کەس و ناکەس
ئەوڕۆ ژیان زۆری دەوێ     رەنجی جۆر بە جۆری دەوێ
من بۆ خاتری ژیان مردووم     دەبێ بمرم هەتا زیندووم
سەرمایەی ژینم لە دەس چوو     لە دەس چوو هەر چی بوو نەبوو
بۆ ئەوەی ژیان بەرمە سەر     خراپ کەوتوومە دەردی سەر
عەسای دەستی ئەم و ئەوم     هەر سەرە تەقەمەو ناسرەوم
چۆڵە چرای شەوی ژینم     بەڵام بەر پێی خۆم نابینم
پێپلیکانی سەر کەوتنم     پێشیلی دۆست و دوژمنم
پێ لە سەر سەرم دادەنێ     جا خۆی بە منەوە رادەنێ
ئاوا نۆکەری هەموانم     بۆ خۆشم بە خۆم نازانم
وا دیارە ئەو دایە پیرە     ئەو رۆشن دڵە بە بیرە
دەیزانی چم لێ بە سەر دێ     دەیان خەتەرم وەبەر دێ
بە پیری گرفتار دەبم     لەش بە بار و بیمار دەبم
ئێستا کۆتری باڵ قرتاوم     راستە تەیارەی شکاوم
لە ئارەزووی نەماو دەچم     لە شینایی بێ ئاو دەچم
لە پەپوولەی سووتاو دەچم     لە شەمی هەڵگیرساو دەچم
لە ماڵی تێک تەپاو دەچم     لە خانووی لار و خاو دەچم
لە گڵکۆی کەس نەماو دەچم     لە جەرگی هەڵقرچاو دەچم
حاڵی ئێستای من ئاوایە     چی دیش دەبینم لە دوایە
ئێستا پیر بووم دڵ شکستەم     بۆ قەفەس باشم پەڕ بەستەم
یا خوا پیر بن ئەوەی جوانن     تا دەردی پیری بزانن
بریا قەت گەورە نەبووبام     هەر منداڵی دەورەی زووبام
چم لە دنیا نەزانیبا     هێندەم مەینەتی نەدیبا
گەورێک زەحمەتی بۆ دیبام     بۆ خۆم هەر نەدیو بدی بام

ئێستاش گویم دەزرنگێتەوە قسەی دایەم بیر دێتەوە
کە دەیگوت کۆتری باڵ قرتاو توند مەڕۆ تەیارە شکاو

# عەسای پیری

پیرو نەخۆش و خەستە، عەسام گرت بە دەستەوە
جوانی لە کوێیە پێم بڵێ (سەید) هەڵستەوە
هەستانەوەم بە لوتفی عەسای زولفی یارمە
تایەک ئەگەر لە زولفی کە چی،بێ بە دەستەوە
هەر چەندە دڵ کە بەستە بە زنجیرەی پەرچەمە
بەندی دڵی پساوی بە تاڵی نەبەستەوە
من وا لە بیری خزم و کەسان چوومەوە برا
پیریش منی وەبیری کەسانم نەخستەوە
باری دڵم ئەگەر چی گرانە بە دەرد و خەم
هاسان بە موویەکی سەری زولفیم دەبەستەوە
دەرمانی دەردەکەم بە کەمێ تۆزی پێیەوە
گەر بێتە لام بە عیشوە بە دوو چاوی مەستەوە
دەردی دڵم سەیید بە دروستی لە گوێ نەگرت
ئێستا کە ماومەوە بە دڵێکی شکستەوە

# پەروانە

دڵا تاکەی خول و ریسوات ببینم
هەمووی هەر شێت و هەر شەیدات ببینم
لە دەوری شەمعی رووی ئەو دڵستانە
وەکوو پەروانە بێ پەروات ببینم
هەموو ئاوات و ئومێدم ئەتۆ بووی
ئەمن قەت نەمدەویست ئاوات ببینم
نەدڵ گەرمی نە چاو سۆمایی ماوە
بە دڵ گەرمی هەتا سیمات ببینم
گوڵم هەر شین و واوەیلامە بۆ تۆ
هەتا کەی شین و واوەیلات ببینم
گوڵم من تۆم دەوێ ئازاد و سەربەست
شنەی لەرزانەوەی باڵات ببینم
سەرم سەودائی یە ئەورۆکە سەیید
چ خۆشە گەر سەری سەودات ببینم

# من و بەهار

ئەو کاتە بای وەعدە کزەی شەماڵێ
پوش و پوار لە رووی چەمەن دەماڵێ
وەدەر دەخا خونچە لە یاسەمەندا
شەبەق دەدا شەونم لە نێو چەمەندا
پێم خوشە هەر لە دوور باڵای ببینم

وەختێک نەسیم دەستێک بە دڵدا دێنێ
بۆ ساتێک دڵ خەمی تێدا نامێنێ
رانـاوەستێ فرمێسکی گەش لە چاودا
داهاتی دڵ هەموو دەدا بە ئاودا
پێم خۆشە هەر لە دوور باڵای ببینم

بەهار بۆ من شەوی رەشە و بەختی رەش
شەونم بۆ من خوێنی دڵە و ئەشکی گەش
بەهار بۆ من خێر و خۆشی ناهێنێ
هەر ئارەزووی دوور و درێژ پێک دێنێ
پێم خۆشە هەر لە دوور باڵای ببینم

ئاخر بەهار رۆژێک بەشی منیش دێ
رۆژێک دوایی شەوی رەشی منیش دێ
بۆم دەخوێنێ بە دڵ بە بێ قەراری
روو بە رووی من بولبول قومری قەناری
پێم خۆشە هەر لە دوور باڵای ببینم

خۆ من ئێستا ئەو نازدارەم نەدیوە
لەو باخەدا ئێستا گولم نەچنیوە
خۆ نازانم گولی سوور و خونچەی ئاڵ
چۆن دەنوێنێ لە پشتی پەردەی دەسماڵ
پێم خۆشە هەر لە دوور باڵای ببینم

مەگەر شەماڵ داوێن بکا بە لادا
هەوری رەشی لە سەر رووی رۆژی لادا
وەلا بەرێ دەسرەی لە مل هاڵاوی
وەدەر کەوێ خاڵ و خەتی نەخشاوی
پێم خۆشە هەر لە دوور باڵای ببینم

خەیاڵ ئەوی خستۆتە بیر و هەستم
من بەو مەیەی نەمخواردووە پێی مەستم
ترسم هەیە ئەوەی دلم دەیخوازێ
وا جوان نەبێ لەگەڵ دلم نەسازێ
پێم خۆشە هەر لە دوور باڵای ببینم

ئەستێرەیەک هەڵدێ لە ئاسۆی ژینم
بەڵام سەید من پیر بووم و نابینم
ئەستێرەی ژین و ئاواتم بە جارێ
ئەو هەڵدێ ئەم لەگەڵ دەچێتە خوارێ
پێم خۆشە هەر لە دوور باڵای ببینم
با کۆن نەبێ هیوای تازەی ئەوینم

# کـوێستـان

ئەو چیا سەر بەرزە گەر گۆشێکی کوردستان نەبێ
نەمدەویست خێری نەبوو بۆ من ژیانی ژان نەبێ
ئەی وەتەن تۆی و دڵم زنجیری دەستوو پێی منن
مەرگە بۆ من گەر ژیانی من لە کوردستان نەبێ
من لە مەیدانی حەوادیسدا سەرم دانا برا
گۆلە مەیدان ناچێتە دەر وەک مەوجی سەرگەردان نەبێ
دەشتی کوردستان بەهەشتە بۆ کەسانە لێی دەژین
لالە و بەیبوون بەڵام شین نابێ تا کوێستان نەبێ
کەس نەبوو فرمێسکێ بۆ من هەڵوەرێنێ جار و بار
بۆ شەوانی بێ کەسی من شەمعی سبحەینان نەبێ
بەو پەرێشان حاڵێیە بووم سەد گرێشم کەوتە دڵ
خاترم جەم نابێ شانە زولفی ئاوێزان نەبێ
کەس نەبوو دەردێک لە من دەرمان بکا لەم رۆژەدا
هەر ئەوەندەش باشە بۆ خۆی دەردی بێ دەرمان نەبێ
ئەو کەسەی وەک گیان نزیکم بوو لە من دووری دەکا
رەنگە پێی وا بێ هەموو شتێکم هەیە هەر گیان نەبێ
حاسڵێ ئەم ساڵەشم وەک ساڵەکانی دی نەبوو
غەیری رەنجی بێ نەتیجە و ئێشی دەست و شان نەبێ
مینەتی دنیا بە پووشێک ناگرم لەم کاتەدا
من کە خەرمانم هەموو کا بێت و دەخڵ و دان نەبێ
هەر بەڵاییکی لە ئاسمان دێتە خوارێ بۆ منە
هەر دەڵێی عەرزی خودای لێ قات بووە جەمیان نەبێ
رەسمی کۆنەی ئەم زەمانە زاڵمە وایە (سەیید)
کەی بەڵادی غەیری بۆ بێ سووچ و بێ تاوان نەبێ

# گـولّی ئـاوات

گوڵێکم بوو کە عومرێک خزمەتم کرد و بە هیوای بووم
کە رۆژێک شین ببێت و سەر لە خاکی تیرە دەرهێنێ
ئەمن هەر چاو لە دوای ئەو بووم

هەوەڵ جار دەنکە تۆوێک بوو بە سەد ئاوات لە چاڵم نا
بە ئاوی چاوی خۆم دەمداشت بە پێی ئاوو هەوای ئەو بووم
هەموو رۆژ هەڵۆدای ئەو بووم

ئەوەندم تێ روانی بوو روا لەو جێگەیە چاوم
هەتا ئەو دەنکە تۆوە ئاخری شین بوو سەری دەرخست
من ئەمجار دڵنیای ئەو بووم

هەموو رۆژێک لەگەڵ ئەو شین بووە راز و نیازم بوو
ئەمن هاورازی ئەو بووم یاری ئەو بووم با وەفای ئەو بووم
ئەمن پەرژینی ئەو بووم و پەنای ئەو بووم

وەکوو منداڵی پێ رۆ دارە دارەی کرد و راوەستا
هەموو کاتێک بە رۆژدا شاهیدی نەشوو نمای ئەو بووم
بە شەودا شەوچرای ئەو بووم

بەڵێ هەر چاوەرێ بووم تاکوو خونچەی کرد و گوڵ پشکووت
کوتم ئاواتی من وا هاتە دی با تێر تماشای کەم
کە عومرێک من فیدای ئەو بووم

بەڵام ئەو رۆژە گەردوون وەک هەموو جار کەوتە سەرسەختی
منیش هەر چاوەڕوانی هاتنی فیتنە و بەڵای ئەو بووم
ئەمن خۆم موبتەلای ئەو بووم

لە پڕهەورێکی دڵ رەش ئاسمانی گرتە ناو باوەش
برووسکەی داو بە توندی هاتە خوارێ رێژنەیەک تەرزە
ئەمن ئەو کاتە لای ئەو بووم

گوڵی ئاواتی جوانی تێک شکاند و کەوتە سەر ئەرزی
ئەوی عومرێک بە هیوای خونچەو بەرگ و گەڵای ئەو بووم
بە داخ داری عەزای ئەو بووم

دەبێ تاوانی چی بووبێ کە وا بەم جۆرە پەڕ پەڕبێ
گوڵێکی وا بە شەونم تازە لێوی ناسکی تەڕ بێ
دەڵێ گەردوون؟ خوداگیری خودای ئەو بووم

بەڵام ریشەی لە ئەرزایە گوڵی من بۆ ژیان ئامادە بە دیسان
لە ریشە نایە بەم تەرزە دوبارە گوڵ دەکا رۆژێ
دەزانم ئاشنای ئەو بووم

ئەمن ئەمجارە بۆ خۆم دەبمە چەتری سایەبانی ئەو
لە باوەش خۆمی دەگرم تاکوو سینگی من سپەر بێ بۆی
ئەگەر سەد جاری دیکەش من فیدای ئەو بووم

# گرِوگاڵ

دەمێکە زەمزەمەی شێعری تۆم لە گوێ نایە
لە گوڵشەنی دڵەکەم نادرێ شنەی بایە
نەسیمی سوبحدەمی پێدەوێ دڵی تەنگم
کە خونچەیی مەدەدی ئەودەمی بزەی نایە
مەسافی شێعرە نە مەیدانی بەزم و لاف و گەزاف
قسەم لە باسی سەرە نەک لە بێ سەر و پایە
هە چی دەبینم بابۆڵەکەی لە هەڵبەستە
برا چ باسە مەگەر شێعر نان و هەڵوایە
هەتا کوو کاڵە لە پێم دا نەبوو بە سەد لەتەوە
لە رێی گەیشتنی ئامانج نەگەیمە ئەم پایە
کەسی نیە کە لە بازاری عیشق سەر بکەوێ
کە دانەنێ سەر و تا دڵ نەکاتە سەرمایە
هەزار کوێرەوەری دێتە رێ برا مەجنوون
هەتاکوو ئەشکێ دەرێژێ بە یادی لەیلایە
لەباخی تەبعی هەتا لالە شین دەکا هۆنەر
هەزار داخی دڵ و دەردی دێتە رێگایە
بەشێعری خۆش دڵەکەم خۆش دەبێ و دەکا گرِوگاڵ
بە دەنگی زەنگوڵە منداڵ لە خەو دەکا دایە
بەهار دێتەوە زستانی ماوەکەم ماوە
کە ئاڵەکۆک لە رنوو بەفری بێتە حاشایە
هەڵاڵە سوێسنە موژدەی بەهاری دێننەوە
بە داخی لالەوە بولبول دەچێتە سەحرایە

بــــە ئـــاوی چـاوی دەدێـرم بـرا لە هــەر لاوە
گــوڵێکی بـۆ دڵی مـــن شـین بـبێ لە هـەر لایـە
بـە یـادی تـۆوە وەهـا مـن هـەمیشە مـەشغووڵم
بــــە بــێ سـەدا لە دڵمـدا هـەرایـە هـوریایە
بـــنای وەفـا پـتەوە چـون حـەقیقی‌یە مـیعمار
(سەیید) ئەگەر چی کـە شاگـردە نـیمچە وەستایە

# بەهار

بەهارە تازە ئەما فەسڵی سارد و سەرمایە
هەموو پەژارە دەڕۆن کاتی خۆشی لە دوایە
لە قاسپە قاسپی کەوان دەنگ ئەداتەوە کەژ و کۆ
لە هاژە هاژی خڕان دەنگی دی لە گوێ نایە
لە داخی دووری زستان نیە رنوو دەگری
لە حەیفی کاتی بەهارە لەگەڵ وی پێ نایە
لە دەنگی قاز و قورینگان لە نێو چەمەنزاران
ئەوەندی گوێ دەگرێ هەر هەرایە هوریایە
ئەما بە بولبولی شەیدا قەرار و ئارامی
دەرەونەوە لە فڕەی باڵی ئاسکی سەحرایە
لە سەر چەمەن گوڵی نەسرین و لالە دەستەملان
دەڵێی لە کۆشکی مرادان و بووک و زاوایە
لە بەر بناری چیاکان لە کیژ و کوڕ پۆل پۆل
دەڵێی فریشتەن و هاتوونە سەیری دنیایە
بە ئارەزووی بەهاران بە سەر دەچێ زستان
بەهار ئەگەرچی هەزار ئارەزووی لەگەڵ دایە
بەهار هاتەوە بیری دەڕۆنە مەڕ دۆشین
جحێڵەکان بە گەمە دێنەوە لە مەزرایە
چ خۆشە کاتی بەهاران دەمی وەنەوشە چنین
بە چەپکە بیخەیە ڕێبازی سەر و باڵایە
بڕێژی ئەشک بە داوێنیا هەڵیرێژێ
لە دەرد و مەینەتی دووری ئەوەی لە دڵتایە

بەهار هاتەوە ئەمڕۆ لە من بە تاقە گوڵێک
بە زەردەیەک بە گوڵێ کێ دەڵێ بەهار نایە
ئەوەی کە مردووە دڵیان بە سۆزی زستانی
پەنا بە گوڵ ببەن ئاخر دەمی مەسیحایە
بەهار هاتەوە ئەوڕۆ دەکەونەوە سەر باڵ
لە بازو قومری و قاز و قورینگ و دوڕنایە
دەکەونە نەغمە و ئاهەنگ و بەزم و گۆرانی
ئەوەی کە ئەهلی دڵ و شێعرو نەغمەو نایە
بە چاوی مەستەوە نەرگس لە لالە دەڕوانێ
مەتاع یۆسفە چون موشتەری زولەیخایە
(سەیید) کەقەتعی هومێدی لەخۆی نەکردووە قەت
کە پیرە دارە بە زەبری زەمانە دانایە

## قەسیدەی بەهار

بەهارە کاتی گوڵ و فەسلێ چوونی سەحرایە
وڵات بەهاری بەهەشتە کە جێی تماشایە
نیشانی هاتنی نەورۆز و کاتی باغ و گوڵە
کە ئاڵەکۆک لە رنوو بەفرێ دێتە حاشایە
چیا و چەمەن هەموو شین بوونەوە بە بای وەعدە
ژیانەوە لە نوێ بەو دەمی مەسیحایە
هەڵالە سوێسنە بەیبوون وەنەوشە و لالەی سوور
دەیانشەکێنێ لە نێو گیا و گژا شنەی بایە
لە قاسپە قاسپی کەوان دەنگ ئەداتەوە کەژ وکێو
نەوای بولبول و قومری نەبێ لە گوێ نایە
لە بەر بناری چیاکان لە کیژ و کوڕ پۆل پۆل
دەڵێی فریشتەن و هاتوونە سەیری دنیایە
من و دڵیش بە هومێدی گوڵ و وەنەوشە چنین
بە داخی لالەوە هەستاین و چووینە سەحرایە
لە هەر گوڵێکی نموونەم چنیو لە باخەڵ خست
بەڵام نە حەجمی دڵم بەو هەموو گوڵ و گیایە
هەتا گەییم بە وەنەوشە کە دەمچنی زانیم
بە رەنگ و بۆن و رواڵەت لە وانی دی جیایە
کوتم وەنەوشە دەزانێ لە نێو گەلانی گوڵان
چ ڕێز و بایی بە تۆ داوە لوتفی ئەو خودایە
وتی دەزانی چیە هۆی ئەوەی کە وا جوانم
چ رەمز و رازە تەبیعەت لەگەڵ منا وایە
ئەوەی کە شەونمی گەش رووی جوانی من ئەشوا
لە قەترە قەترەیی ئەسرینی چاوی شەهلایە

نەسیمی کاتی بەیانان کە ئارەقم ئەسڕێ
هەناسەیێکی بە سۆزی دڵێکی شەیدایە
شەوێکی باوەشی من تاکوو ڕۆژ نەکا بە سەرین
گزنگی تاو لە سەران ناکەوێت و هەڵنایە
وەکوو شەمامە بە ڕۆژا لە دەستی دڵدارم
شەویش کە جێگەیی من چینی زولفی تاتایە
قسەی لە زولفی ڕەشی یاری دلبەری من کرد
ئەوەی کە دین و دڵی من لە داوی ئەو دایە
بە وەعدە دەستی شکاوی دڵی منە چینی
وەباڵی گەردنی بێ سووچە هەر لە ملیایە
چیە کە خوارە وەکوو ماڵی لامە بێ مەیلە
ئەوەی کە کەچڕەوە کەچ خولقە پێی دەڵێن لایە
خەیاڵی موبهەمی وەسلە کە بێ سەرئەنجامە
شەوی درێژی فیراقە کە ئاخری نایە
دیارە عاشقی تاوانە بۆیە زولفی کە چیش
تەنافی گەردنە زنجیری سەر هەتا پایە
هەزار گرێی لە دڵم خست بە چینی داوێکی
هەزار داوی لە ڕێمدا چنی بە هەودایە
بە زولفی ڕەش چ بڵێم ڕۆژی رووی لە من پۆشی
بەڵێ کە ڕۆژی ڕەشی بێ کەسان هەر ئاوایە
تەمام بوو تایەکی ئەو زولفە خاوە دەستۆکەم
خەیاڵی خاوە کە دیم ئەو تەمایە لەو تایە
ئەگەر چی سایەیی ئەو زولفە قەت نەکەوتە سەرم
(سەیید) خودا نەبڕێ قەت لە سەر من ئەو سایە

# چوونەوەی دێ

تازە بەینێکە چوومەوە «جەمیان*» / بە هەوای ژینی تازە بە دڵ و داو
دێیە مەڵبەندی خۆشی بیرەوەریم / کە وەدڵ دێنێ تین و هێز و هەناو
دڵ خەفەتبار لە شاری بێ دەرمان / شاری بێ شوور و پڕ شەڕ و شێواو
کەس نیە دەردی دۆستی دەرمان کا / هەموو لێک زیزن و لە یەک تۆراو
شوێنەواری تەمەددونی شاری / دووکەڵی بێنزە کۆن و جیبە شکاو
شار ئەوەندەی لە جوانییا ماوە / لاوی سەرمەست و کیژی مل بەدراو
گەر دەپرسی لە حاڵی دێش چۆنە / گشتی ویرانە پاکی لاروو خاو
هەر کە دیم ئەو هەموو کەلاوەی دێ / کردی خوێنی دڵم لە سینەکەلاو
باخ و ماڵێک بوو جێ هەوارگەی دڵ / ماڵی رووخاو و باغی شین لێ بڕاو
کێوەکان سەوز و سەرکەشن ئێستاش / دەر و دەشت و چیا بە گوڵ خەملاو
خۆشە سەیرانی دەم رنووی کێوان / ئاوی هەڵدێر و قەڵپەزەی بەفراو
لای ئێواران و کارە کاری مەڕی / دەنگی بلوێری شوانی چێشتەنگاو
بە هومێدی خودا و پێغەمبەر / گەر تەمەن مابێ رۆژێ دێتەوە باو
دەبمە جووتێری کشت و کاڵی زەوی / دەبمە وەرزێری دەست وپەل قەڵەشاو
زەوی یەکانم بە ئاوی کانیاوان / کاتی خۆی پاکی شین دەکەم بە کەشاو
دەبمەوە خاوەنی خەلە و خەرمان / گەرچی خەرمانەکەم درا دەم ئاو
دەستی ماندوو لە سەر زگی تێرم / دادەنێم جا دەڵێم براله سڵاو
لێی دەنێژم لە باغەکانی نەمام / خوێنی جەرگیشی لێ دەنێم بە شەواو
تا بیبێتە نەمام دوا رۆژم / بۆ منالان کە دەبنە گەورە پیاو

*-گوندێکە لە نێوان بۆکان و سەقزدا و سەیید خاوەنی بەشێک لەو گوندەیە.

بەر بەیانان بە قاسپە قاسپی کەو    راوچیان دەچنە بەر بنار و شەتاو
کەو وکەرویشک و سی و مراوی و قاز    لە چیاو و چۆمەکان دەکەونەوە داو
پاییزان کاتی راوە کەرویشکە    خەم رەوێنە لە بەر بناران راو
ئەسپی سواریش وەکوو شەماڵ بفڕێ    بۆ هەموو جێ بە سەر رەو و پڕتاو
تاژی خۆش بەز وەکوو هەڵۆ و شاهین    بۆ نچیر بێ بە هەڵمەت و شاڵاو
سەنگە سیرێکی ساز بکەم وەکوو زوو    قووتی رۆح بێت و قووەتی هاناو
زەحمەتێکی دەوێت و داخی دڵێک    دێتەوە دۆخی خۆی هەموو بە تەواو

# چۆڵە چرا

بە عەهدی خۆم ئەمن شەرت بێ وەفا کەم
دەبا هەر بێ وەفا بێ ئاشناکەم
ئەگەر رۆژم نەبوو کەس ئاشنام نین
هەموو نائاشنان کاکە و براکەم
کەسێکی دی عەبام ناخاتە سەرشان
ئەگەر تۆزێ درا شانی کەواکەم
ئەوەی وەک کۆی دەبینی کایە گشتی
کە بێم خەرمانەکەم کاتێ بە با کەم
لە بەر پەروانە دەورەم چۆل نەبوو قەت
هەتا شۆقێکی بوو چۆڵە چراکەم
دەزانی چەندە چاک بووم من لەگەڵ دۆست
کە چی ئێستانە خۆم چاکم نە چاکەم
نەکوو ئەو یارە گەرد بگرێ دلّی لێم
دەبوو گیانیش وماڵیشی فیداکەم
کە چی ئێستاکە هەر ئەو نابرایە
دەڵێ نەمدیوی ناتناسم براکەم
دەڵێم تەرکی هەموو کەس کەم لە داخا
هەتا مەجبوور نەبم هەر بێم و راکەم
لە ئاوی چاوما غەرقم بڵێم چی
لە خۆم خنکاوترە خۆ ناخوداکەم
ئەگەر رۆژم نەبوو رووی لێم نیە کەس
(سەیید) وەک رۆژ پەرستە ئاشناکەم

# پووڵ و پارە

لە دوای بیسمیللا و سەلات و سەلام
هەر لە پووڵ جوانە سەردێڕی کەلام
هەوەڵ و ئاخری هەر قسێکی جوان
پووڵە و پووڵە و پووڵ باقی وەسەلام

***

بە پووڵ دەتوانی وەدەستی بێنی
لە قیامەتیشدا بەهەشتی باقی
لە ڕێی خودا دا خەرجی کە پارە
خودا دەتداتێ کەوسەر و ساقی

***

پووڵ لە بەر چاوی کەسی زاهیر بین
هەر جارە دەکا جیلوە بە جۆرێ
تۆ جل وبەری ئەسپی عەرەبی
لە کەرێکی کە ڕەنگی دەگۆڕێ

***

پاکەتی پۆستی تەمری دوو ریاڵی
شارە و شار دەیبا بە پڕی و خاڵی
قەتاری ئاسن بەو سەنگینی‌یە
چەندە سووک دەکا بۆ پووڵ حەماڵی

***

وەسیەتە بۆ تۆ باش لێی بە حاڵی
قەت مەچوو مەیدان بە دەستی خاڵی

ئــــەگـــەر پـــوولْ هــەبێ دەیــباتە دواوە
ئـەو قسـەی مـەشهوور بە چـەکین دالْێ

***

فکـــری لێ مـــەکـــە قسـەت لە پـێشە
هــەر لە مشـتا بـێ دوو قـڕان بـۆ کـێشە
ئـــەگـــەر بـێ پـوولێ لە سـەری مـەڕۆ
مـــەودا کـــورتیش بـێ زۆری مـەکـێشە

***

عـــاشقە رووتـــەی بـــێ پـــوولْ و کـاری
لێت نــــــاشیرینە عــــــیشق و دلْداری
ئـــەوە بـــزانـــە هـــەرگیز چـۆل نـابێ
جـێ ژوانـی عـاشقی بـە دەست و دیـاری

***

ئـەگـەر یـارەکـەت بـە قـڕ و ئـەدایـە
یـــا زۆر خـــۆگرە یـــا بـــێ پـەروایـە
بـــە تـــۆقی تـــەلا پـــوولێ لە مـل کـە
مـــلی کـــەچ دەبـــێ و سـەری هـەلْنایە

***

بـێ پـوولْ لە جـێیان بـە دەنگ دەیـناسن
ئـــەوانـــەی وریـــا و ئـــاکـار شـناسن
بـۆ کـارێکی چـووک دەتـهێنن و دەتـبەن
دەبـــێ هـــەلْبەستی بـۆی کـالْەی ئـاسن

***

ئـــەی پـــارە رۆژی هـــیممەتە سـادەی
بـێ مـیهری تـا چـەند بێ مـەیلی تـا کـەی

# ئەهلی شاری

ئـەهلی شـاری دەبـێ وریـا بـێ بـڕ و بـاوی هـەبێ
فـیز و پـۆزێک و دەمـێکی تـەڕ و پـاراوی هـەبێ
بـە کـوتەی وان نـەوەکـوو ئەو کـەرە کـرمانجەی دێ
نـە زمـانی بـێ نـە زاری بـێ نـە زاراوی هـەبێ
کـفتە شـۆرباوی هـەبێ چـەنگی لە گـۆشتاودا بـێ
سەری هەر مانگ بە سەر و پێیەکی شۆرباوی هەبێ
سەرو پێیەک نە بە گیپە و بە بـرینج و تـەڕە مـاش
رەقـە لاقـێکی وەهـا لەززەتـی قـاچاوی هـەبێ
هەر کەسێ نەکرێ سبەینان لە خـەمان جێ ماستێک
ئـەهلی شـاری نـیە بـا پـوولی بـە لیشـاوی هـەبێ
هـەموو عـەسران تـەڕە پـیواز و پـەنیری پێستەی
نـانی تـازە کـە گـوڵی کـردبێ مـاستاوی هـەبێ
جـار بـە جـارێکی نـەهاران لە کـەبابی حـەمە شـەل
شـیشە جـەرگێکی نـەبرژاو و نـەسووتاوی هـەبێ
بـاوە وانـێک لە قسـاندا وەکـوو وانـێک هـینە
هـینی ئـێمەش وەکـوو وانێکە ئـەگـەر بـاوی هـەبێ
خـۆشەویستن لە دڵا مـیللەتی ئـەم شـارە بـرا
دڵ کـە وریـا بێ دەبێ قـەدری لە بـەر چـاوی هـەبێ

# تەم

بینە دەر رووی وەکوو رۆژت لە تەما
ماوە بۆ و رۆژە دلْم هەر بە تەما
رەمزی حوسنە کە لە ژێر باری لەشا
نەونەمامی قەد و بالاّی نە چەما
لە سوێی گێلگێلەکانی دلّەکەم
وا دەلەرزێ وەکوو هاتبێتە سەما
پیرەدار گەرچی بە زۆر دانایە
من چەمیم گیانە بە جوانی لە خەما
ئەو هەموو دەردە کە تۆ دیت ماوە
ئەو وەفا و مێهرە کە من دیومە نەما
نوختەیی زیعفی دەمی بووکە نەبوو
کەمی دیکەی نیە ئیللا لە فەما

## چەقە ساو

چەندە پێم خۆش بوو کوتت باوەلێ باوێکی بەسە
بەلێ بۆ ئەوکەسە وا موخلیسە باوێکی بەسە
مـن بە دڵ عاشقی زارم نیە چاوم لە ویسال
دڵی مـن قانیعە هەر سیلەیی چاوێکی بەسە
دڵتەڕێکی وەکوو مـن بەسیە ئیشارەی چاوی
گڵ کە نمناک بێ لە خۆیدا نمە ئاوێکی بەسە
شایە ئەوکەمەری جوانە ببێتە دۆی مـن
من گەڕێکم بەسە شاییش هەموو تارێکی بەسە
شێعری تۆ تیغی چەقۆی تەبعی منی تیژتر کرد
تەبعی من تیغی دەبا نە چەقە ساوێکی بەسە
یادی تۆم ناشت لە دڵا کفنی وەفام تێ پێچا
کە فەقیر قوڵکەیەک و نیو گەزە جاوێکی بەسە
تابی دووری نیە سەیید بە جەفا مەیکووژە
پیرە پیاوێکی وەکوو من تەب و تاوێکی بەسە

بـــــرینداره دڵــــم پـــــردەرد و ئـــێشه
ســـــەری ســـــارێژه ئـــەمما نـــێوی رێشـــه
دەهـــۆڵه دەنگـــی وا دوور دێ بـــه خـــۆشی
ئەگەر خۆشی، بێ ئەویش بۆ قـەوم وخـوێشه
بـــــه زاهـــــیر هـــەنگوین، شـــیرینه، نـــۆشه
ئـــەگـــەر مـــێش بـــتگەزی زۆر تـــاڵه، نـــێشه
مـــــەبادا تـــــاڵی ئـــەم ســـەر رشـــته بـــپسێ
ئـــــەتۆ لەم کـــــاتەدا زۆری مـــــەکـــێشه
بـــرا ئـــەمرۆکـــه کـــەم کـــای کـــۆن بـــه بـــاکـــه
بـــــرینی کـــــۆنه نـــــاسۆری بـــــه ئـــێشه
بـــــه قـــەد مـــێروولەیەک کـــێشت نـــەماوه
ســـــەید چت داوه تـــــۆ لەم کـــێشه کـــێشه

# زمانی مادەری

کاری ئەم دەور و زەمانە بە هەوا و سەر سەری‌یە
خۆ بشارێتەوە هەر کەس بەهومێد سەروەری‌یە
پێم دەڵێن هۆنەری وەک تۆ نەدەبوو هەڵبەستت
بە زمان خۆتەوە بێ تاکوو بڵێن مادەری‌یە
هۆنەرێکی وەکوو تۆ یا خووا هەناوت رەش بێ
شێعری زۆرت کوتووە یا دەری‌یە یا وەری‌یە
کوتم ئەی کاکە مەپرسە کە زمان ئامانە
ئەو سەرە دوورە لە ئافەت لە زمانی بەری‌یە
ئەو سەرەی نەیبێ لەسەر یا خەم‌وعیشقی وەتەنی
شێتە دێوانەیە بێ عەقڵە لە چاکی عەری‌یە

# ● سەرمەستی ئەوین ●

سەرمەستی ئەوینە دڵ و زنجیرە لە پێما
هەرچەندە کە ئێستاکە نەسەرما و نەپێما
ڕێبازی ژیان پڕگوڵ و پڕ لالەیە ئەمما
هەر داخی دڵە بۆ من و هەر خارە لە ڕێما
ئەو وەختە کە هاوڕێ بوو، ئەمن لەنگ و ئەویش ساغ
بێ ڕەحمە بەزەییێکی نەهات کاتێ بە پێما
گەر حاڵی منی خەستە دەپرسن کە چلۆنم
بێ لاقم و کەوتووم و لەدەس چووم و لە جێما
من ماومەوە بێ یاوەرو بێ یار و ڕەفیقان
ئاواتی دڵە ماوەتەوە چاکە بەجێما
غەیرەز منی بێچارە لەنێو کۆڕی ئەویندار
بێ هەمدەم و تەنیا و غەریب ماومە کێما
هەر قافڵەیە دێت و دەچێ پێش دەکەوێ زوو
سەر قافڵە سەید بوو عەجەب مام کە بەجێ ما

# دەنگی مامڵێ

بــە ئــەستۆی تــۆ وەبـاڵی کـوشتنی مـن
خــەمی زولفت کــە ئـاڵا بـوو لە گـەردن
ئەجەل بێ دەردی خۆمت بۆ بـەیان کـەم
هـەتا پـێت وا نـەبێ پـێم سـەختە مـردن
دڵم مــەجنوونی زوڵفــێ بــوو پـەرێشان
ســەرم مــەفتوونی بــاڵایەک سـنەوبەر
نــە ئـەو زولفـە تـەنافی کـرد لە ئـەستۆم
نە سایەی سەروی باڵای خستمە سەر سەر
لە وەخــتی مــردنا گــەر تــۆم لە لا بــێ
بەڵێ ئەو وەختە مردن خۆشە نەک ژیـن
بە دڵ سۆزی دەبەن تەرمم لە سەر شـان
کە چاو جوانێکی وەک تۆ بۆم بکـا شـین
دەڵێ (سەیید) کە وەسیەت بـێ بـخوێنن
بــە دەنگــی مــاملێم یــاسین و تــەڵقین
لە رۆژی مـــەحشەرا بـــا پــێ بــزانــن
فەقەت ئەو دەنگە بۆ خۆشیەک‌کەدەمدین

## ● تەرجەمەی شێعرێک لە مەستوورە ●

ئەگەر زولفت لەگەڵ یەک نەبێ دیوانەیی کەمتر
لە شەمعی رووت دڵم دووری بکا پەروانەیی کەمتر
هەتا دووربم لەتۆ، قازانجی تۆیە پێت بڵێم بۆچی
کە غەوغایەک لە دەورت کەم دەبێ ئەفسانەیی کەمتر

لە بەزمی تۆ کەنارم گرتووە و بێ ماڵ و حاڵە دڵ
ئەتۆ ئاسایشی زیاتر، منیش ئاسانەیی کەمتر
بە چاوی مەستی ئەو مەست و خومارم بۆچمی مەیگێڕ
ئەگەر تۆش نەمدەیەی جامێ، چ بوو پەیمانەیی کەمتر

دەزانی بای سەبا ئەو کاتە بۆنی زولفی تۆی هێنا
لە رەونەق کەوتووە بازاری عەتتار، شانەیێ کەمتر
لەبەر داخی ئەوینت من لە ناڵە و دەردی دڵ کەوتم
دڵم مەستی ئەوینە، ناڵەیی مەستانەیی کەمتر

سەیید مەجنوونی لەیلابوون دڵی مەستوورە وا جوانە
لە کۆچی دوایی یا باپێم بڵێن فەرزانەیێ کەمتر

# چیمەن و نەسیم

بە سەر چیمەن دا هات نەسیم بە کانی گزنگ ئەنگووتن
چیمەن چاوی لە خەو رابوو نەرگسەکانی پشکووتن

***

بە هیوای بای وادەی خۆی بوو دەیزانی بەهار نەزدیکە
دێتەوە باوەشی چیمەن مەحتەلی ناکا چی دیکە

***

چاوی لە شەونمی ئاوات پڕ بوو لە مرواری رەنگین
دەتگوت پێدەکەنێ چاوی کاتێ مەوجی دەدا ئەسرین

***

زانی بای وادەی خۆیەتی دڵی ئەم باسەی راگەیاند
چیمەن لە خۆشی ئەم ڕازە مرواری یەکانی هەڵوەراند

***

# دەنگی دوور

دەنگێ دێ لەو دیوی ئاسۆ          بانگ دەکا ئازیز بۆ نایەی
لێم نەدیوی یا لێم زیزی          یا سەرگەرمی گەمە و کایەی

***

من قەترەی شەونمی گەشم          کاتێ شەو ئەزرینگێتەوە
لە سەر بەرگی گوڵێک بەیان          پێدەکەنێ و دەتوێتەوە

***

تۆ ئەو گوڵەی ژینی منی          بە خوێنی دڵ ئاوم داوی
بۆ چی بۆنت ناکەم ئێستا          خۆت بە منەوە ئەسیر مەکە

***

من تۆم لە بیر ناچێتەوە          بەڵام تۆ قەت من بیر مەکە
یا هەر من گیرۆدەی تۆ بم          خۆت بە منەوە ئەسیر مەکە

***

من لە سەحرای بێ نیشانیم          من لە گەرووی هەژدیها دام
من یۆنسی دەریای ژینم          من لە گێژاوی دەریا دام

***

گێژ و خولی ئەم دەریایە          گێژم دەدا و دەخولێمەوە
بەرەو وشکی دەڕۆم بەڵام          هەر دەڕۆم و هەر دێمەوە

***

من قەتیس ماوم لەم هەردە          ڕێی هاتنە خوارم بەسراوە
من تەیرێکی نابەڵەد بووم          نەمزانی چوار دەورەم داوە

***

تۆ منداڵی بەڵام ئەمن　　لە نێو بێشکەی ژیندا گیرم
دەس بە دەسرازە بەسراوم　　باڵ شکاوم من ئەسیرم

* * *

لە مابەینی من وتۆدا　　گۆمێکی قووڵ و بێ بنە
ئەورۆ سەرم لێ شێواوە　　ڕێگای بوارم لێ ونە

* * *

ئاخ بۆ مەلەوانێکی ئازا　　بمکاتە قەلاند و شانێ
یا بۆ تەیرێکی تیژەباڵ　　لە سەر باڵی خۆیم دانێ

* * *

سامم لە دەریا بشکێنێ　　شەپۆلەکان ڕاوەستێنێ
لە بوار بمپەڕێنێتەوە　　بۆ لای تۆ بمهێنێتەوە

* * *

# ریسوا

کەس لە دنیادا وەکوو من عاشقی ریسوا نەبوو
وەک دڵم بۆ پەرچەمی ئاشوفتە و شەیدا نەبوو
وام دەزانی کەس لە من بۆو زولفە شەیداتر نیە
تا نەسیمی بەربەیانم دی کە دیتم وا نەبوو
دەم بە دەم بۆ خۆم دەسووتێم و بەڵام بۆ شەمعی رووت
وەک دڵی من هیچ دەمێ پەروانە بێ پەروا نەبوو
وێنەیێکی چینی زولفی بوو لە چاومدا کە من
هەر دەگریام و گرێ و گوڵێکی چاوم چا نەبوو
وەک نەسیم بوو ولە هیچ شوێنێ لەکەس جێگەم نەگرت
بۆیە بۆ من وەک نەسیمێک مەئمەنو مأوا نەبوو
هەر دەڵێی کوێستانی کوردستانە باخچەی سینەکەی
هیچ گوڵێکی جوان نەبوو لەودا ئەگەر لەمدا نەبوو
دڵ بە دووی خۆیدا دەبا وەعدەی ویسالی پەرچەمی
من لە بەختی رەش هومێدێکم بە وەعدەی وانەبوو
هەرچی تێکۆشام شەوی دەستی من و دەرزی بەرۆک
ئەو لە داوێنی نەبۆوە ئەم لە یێخەی جیا نەبوو
من دڵم دایە بە سەودای تایەکی زولفی کە چی
کەچرەوی کرد و لەگەڵ من مایلی سەودا نەبوو
کەس وەها ورد و زەریف نەدوا لە خاڵی گەردنی
هێندە رێکەوتوو (سەیید) نەقشێک لە سەر مینا نەبوو
گۆبەرۆک دەستی لەسەر ئەوسینگ ومەمکەی هەڵنەگرت
تا سەری زولفی لە مەیدانا سەری پەیدا نەبوو

# گوڵی مەحبووبی شەو

مەحبووبی شەو گوڵی بۆن خۆش    بزوێنەری هەست و بیرم
ئەوەندەی ئەتۆ ئازادی    من سەد ئەوەندە ئەسیرم

* * *

تۆ مات و بێدەنگ و ئارام    خۆ دەنوێنی بە نهێنی
بەڵام لە پشت پەردەی خەیاڵ    هێزی دەروون دەبزوێنی

* * *

تۆ هاورازی یاری من بووی    دڵ هەر لە لای تۆ بە جێ دێ
کاتێک لە باوەش ئەودا بووی    بۆیە بۆنی ئەوت لێ دێ

* * *

مەغزم بیرم فکرم هەستم    هەمووی بە تۆوە ئاڵاوە
هێزی جووڵانەوەی ژینی    لەگەڵ خوێنم تێکەڵاوە

* * *

ئەم دیوە و دیوت بۆ نیە    درگا رێ لە تۆ نابەستێ
تۆ بیری وردی هونەری    هیچ کۆسپێکت پێ ناوەستێ

* * *

هەناسەکەت تێکەڵاوی    جریوەی مەلی بەیانان
هەر دوو ئەسپاردێکی تازەن    لە بۆن لە ژین و لە ژیان

* * *

مەحبووبی شەو گوڵی بۆن خۆش    من هەمیشە تۆم لە یادی
تۆ پەیام هێنەری شادی    تۆ بۆنی خۆشی ئازادی

* * *

# شەمعی مەزار

هــەتا مـاوم ئـەمن شـەمعی مـەزارێ هـەڵبکەم چـاکـە
به ئەسرین لالەیەک با شین بکەم لە جیاتی شەم چاکە
هەناسەم زولفەکەی لادا وشـە و چـاوی لە خـەو رابـوو
ئەگەر نەرگس لە خەودا بێ نەسیمی سوبحدەم چـاکـە
بە ئەسرین گفت و گۆی دڵ دانەمرکا بۆیە هەر دەگریم
ئەگەر ئاور لە سەحرا بەر بێ هەر سێڵاوو چـەم چـاکـە
لەبەختی رەش هەموودەسکەوتی ژینم هەر خەموودەردە
بە جامی مەی ئەویش رۆژێ وەدم ئـاوی بـدەم چـاکـە
بە دڵ لەو یارە ویستی یـارمەتیم بـوو نـەمدەزانـی مـن
کە ویستی زۆر لە بێ جەرگ و دڵان تا بکرێ کەم چاکە
دەلێــن شـادی فـەرامـۆشیشی پـێوە مـن کـە نـەمدیوە
نەکوو ساتێ لە بیرم چێ هەمیشەم دەرد و خەم چـاکـە
وەکوو نەی هەر لە سینەم دا دەناڵم بـا نـەزانـێ کـەس
کە ناڵەی بێ کەسێکی وەک (سەیید) بێ زیر و بەم چاکە

# تۆبە

لە دڵما وەک گرێیە چینی زولفی ئەو بەڵەک چاوە
نەسیمی بەربەیان تاکوو نەهات ئەو عوقدە نەکراوە
تەماشای چینی زولفت وەک بە شەو رۆیشتنی رێیە
کە نووری چاوی من لەو رێیەدا هەر کەوتوو هەستاوە
ئەوەندەی من بە کوڵ دەگریم گریێ لێ نابڕێ چاوم
دەڵێی وێنێکی چینی زولفی تۆی تێدا بە جێماوە
مەگەر فرمێسکی چاوم گفت و گۆی دڵ دابمرکێنێ
دەنا ئاوری ئەوین هەروا بە تینە سۆڵی هەر ماوە
دڵ و دینی بە جارێ لێ ستاندم نیو نیگای چاوی
بە تیرێ دوو نیشانەی پێکەوە ئەو شۆخە پێکاوە
ئەگەرچی نامەوێ من تۆبە بشکێنم خودا چ بکەم
هەموو جار روورەشی لای تۆم دەکا ئەو پەرچەمە خاوە
خەیاڵی زولفەکەی ویم هاتە پێش چاو دوێ شەوێ (سەیید)
ئەوە سایەی لە چاوما ماوە چاوم بە کلە نەڕژاوە

# ئاورگـە

لە بەر تـۆ دەمـرم و نـاژیم لە بـەر خـۆم
دەسووتێم وەک شەم و قەت نایە بۆ سۆم
ئـەمن ئـاورم لە خـۆم بـەردا لە بـەرتۆ
کە چی تۆ خۆڵی خۆم ناکەی وەسەر خۆم
دەمـێ فـرمێسکی چـاو وشکـایی نـایە
شـەتاوی بـێ بـوارە چـاوە یـا چـۆم
غـەمی کـۆنەت لەگـەڵ دڵ بـۆتە هـاوڕاز
بـنێرە تـۆ خـەمێکی تـازەتر بـۆم
ئـەتۆ ئـەو زولفـە تـا تـایەم لە مـل کـە
وەبـاڵی ئـەو گـوناهەی تـۆ بـە ئـەستۆم
شەویش بێ هەر دەڕۆم من روو بە ئـاسۆ
ئـەگـەر ئـەستێرەیەک هـەڵبێ لە ئـاسۆم
ئـەمن ئـەو بـەردە وا شـیشەی شکـاندم
لە دەس یـاران دەبـێ بیدەم لە ئـەژنۆم
لە یاریدا ئـەگـەر راست بـێ وەکـوو مـن
کە وا بـێ تـۆ مـنی و کـاکـە منیش تـۆم
(سەیید) چ بکا لەگەڵ خۆت ولەگەڵ خۆت
لەگەڵ خۆم غەیر و بێگانەم لەگـەڵ تـۆم

# هەوای بەهار

کـاتی بـەهارە جـوانـە چـرۆی سـەر چـڵی چـنار
پـیران جـحێڵ دەکـاتەوە لوتـفی هـەوای بـەهار
عـاشق دەبـا هـەلاڵە و گـوڵ پـڕ بـە بـاخەڵی
بـولبول دەبـا لە لالە و سـونبول بـە کـۆڵ وبـار
یەک رەنگ و سەوزە پۆشە هەموو دەشت و کێو و کەژ
فـەرقی نـیە لە بـەینی سـیا کـێو و لێـرەوار
شـەونم دەخـاتە بـاوەشی گـوڵ گـەوهەری ئـەوین
لالەش دەبـێتە بـووکی بـەهار و شـەمی مـەزار
بـولبول بـبینە ژالە و لالەی دەوێ بـە جـووت
مـندالْ ئـاو و ئـاوری پـێ جـوانـە بـۆ قـومار
تـا چـاو هـەتەر دەکـا گـوڵ و گـیا سـروەیی نـەسیم
ئـارام دەیـانشەکـێنێ لە پـێ دەشت و بـەر بـنار
چـەن جـوان و جـێی هـومێدە چـرۆی تـازە دەر بکـا
هـەر وەک نـەمامی تـازە لق و پـۆپی پـیرەدار
هەر کەس بە دەست و دیاری‌یە بۆ جێژنە (سەیید)یش
چـەپکێ گـوڵی وەنـەوشە بـە شـێعرێکی ئـابدار

سەیید ٧١/١١/١٨

# هەوری رەحمەت

شەو و رۆژ چاوی من ئەسرین بە سەر دڵدا دەبارێنێ
لەسەحرای بێکەسان کەی هەوری رەحمەت لالە دەڕوێنێ
گوڵێکم دەس کەوێ دوای مردنم شەمعی مەزارمی کەم
گەڵایەک لەو گوڵە دنیای ژیانی من هەموو دێنێ
لە بەر بەختی رەشم هەر چین دەخاتە پەرچەم و زولفی
نەسیمی بەربەیان لە کوێیە دەستێکی وەبەر بێنێ
وەکوو فرمێسکی داکەوتوو لە چاوان کەوتمە سەر رێیان
دەبێ یار و نەیار تابێ بە لاما پێیەکم لێنێ
وەکوو پیری موغان شیشەی دڵی خۆم داوەتە دەستی
کەچی ئەو وەک منالی هیچ نەزان ئەو شیشە دەشکێنێ
دڵم گیرۆدەیی داوێکە گەر جەوری رەقیب بێڵێ
وەفادارە هەتا دوا رۆژی ژین ئەو تاڵە ناپسێنێ
لە ئەشکی چاوودەریای دڵ سەمەر هەر گەوهەری عیشقە
دەدروێ بەرهەمی خۆی هەر کەسێ لەو دانە دەیچێنێ
کەسێ دەس ناکەوێ دەردی دڵی (سەیید) لە خۆی ببیە
کە بۆ سازی شکاو گوێ ناگرێ کەس تا بناڵێنێ

سەیید ٧١/١١/١٥

# کیژی دیهاتی

کـیژی شـاری کـاتی بـۆ سـەلمانی دەچـن و دێنەوە
وا لە خــۆیانیان دەگــۆڕن هــیچی نــاناسرێنەوە
دەسـتی سـەلمانی شکـێ شـێوەی سـروشتی تـێکدەدا
هـەر لە جـوان نـاچن دەنـا هـەر چـی بـلێی وا دێنەوە
لێوی سوور ئەبرۆ تراشراو پرچی لوول پش‌چاوی شین
هەر وەکوو تـەسبێحی شـێت هـیچ کـاتێ نـاهۆنرینەوە
کـەس فـریو نـادەن بـە چـارشێوی فش و پشـتێنی زل
کـیژی دێـهاتی بـە کـولوانـە و بـە بـەرهەڵبێنەوە
داری چـاکـی نـین کـە ئـاڵا بـن بـە پـارچـە یـا پـەڕۆ
سـەروی ئـازادن بـە بـێ پـیرایـە دەشـرازێنەوە
ئاڵەکۆک نین سەر نـوقوم بـووبن لە نـێو پـرچ و پـەچە
سـەر بـلندن وەک گـوڵی مـەریەم دەمـێ دەکـرێنەوە
ڕۆژ و مـاتیکیان نـیە هـەر دەم بـە رەنگێ بێنە دەر
پاک و یەک رەنگـن وەکـوو ئـەستێرە دەدرەوشێنەوە
ئـاوی روونـی کـانیاوی بـۆتە ئـارایشگـەیان
بـۆیە وەک پـۆلی پـەری وان تـا لە کـانی دێنەوە
تـۆقی زێـڕ نـایێتە تـۆقی لەعـنەتی مـل موشتەری
ڕۆژێ دێنە سەر مـەحەک رەش دەبـنەوە دەپسێنەوە
هیچ دەزانی چەندە جوان بوو کاک (سەیید)دابی قەدیم
گـۆبەرۆک و کـەمبەرەی زێـوین لە سـەر پشتێنەوە

# تیر و کەوان

کوتم زولفی پەرێشان کە نەسیم بەشکوو خەمم لاچێ
دەڵێ چین و گرێ هێند زۆرە چ بکەم دەستی تێ ناچێ
دەمت هێندە پچووکە بمدەیەی گەر لەو دەمە ماچێ
ئەگەر بۆ من بەهاکەی گیانە بۆ تۆ هیچی تێ ناچێ
موژەی وەک تیرە ئەبرۆی وەک کەوان ئەمنیش نیشانەی ئەو
دەبێ پێش وەی لە سینەم تێپەڕێ تیری لە دڵ ڕاچێ
چەمەن خەملیوە کوێستان سەوزە دار هاتوونە گوڵ کردن
بەهارە پێی بڵێن با ئاڵەکۆکیش پرچی هەڵپاچێ
لە هەورازی ژیان سەر ناکەوێ ئەستێرەکەی بەختم
ئەگەر بیۆ سەر کەوێ پرشنگی نابێ زوو دەبێ داچێ
هەتا چاو لێک دەنێم هەر وێنەکەی تۆ دێتە بەر چاوم
لە خەودا شەم دەبینێ چاوی پەروانە لە خەو ڕاچێ
سەید کەشتی شکاوم من لە گێژاوی ژیانمدا
لە کوێیە بای موافق سەر کە لەم گێژاوە دەرناچێ
لە هەورازی ژیان سەر ناکەوێ ئەستێرەکەی ژینم
ئەگەر بیۆ سەکەوێ پرشنگی نابێ زووە بێ داچێ

# پەروانە

پێم دەڵێن بۆ مەجلیسی یاران بە بێ پەروانە چی
من بە بێ پەروانە چم چاکە بەڵام پەروانە چی
سلسیلەی زەنجیری مووی ئەو شۆخە تۆقی گەردنە
من لە مل خۆیدا دەماڵم ئەی دڵی دێوانە چی
دەس بە داوێنی ئەوین بووم دەس نەگەیە دامەنی
ئێستە داماوم کە ئەم دامانە بەو دامانە چی
داستانی لەیلی و مەجنوون دەڵێن ئەفسانەیە
گیانە پێی باوەڕ مەکە جێی باوەڕو ئەفسانە چی
جامی مەی وەختێ لە مەیخانە منی دی پێکەنی
پێی کوتم (سەیید) ئەتۆ چی و مەیکەدە و مەیخانە چی

# کازیوە[١]

بـــرا رێگـــەی ژیـــان دوور و دریـــژە و پـــێچ و نـــادیوە
هەموو ژینم بە سەر چوو ئـێستە ڕێم تـا نـیوە نـەبڕیوە
حەریف دوو ڕوو نەبێ قەت پوولی سەبرم بێ رەواج نابێ
سکەی بەخت و زەفەر دوو ڕووی هەیە ئەمدیو وئەودیوە
لە ئاسۆگی ئەمەل سـەر نـاکـەوێ ئـەستێرەکـەی بـەختم
مەگەر شەو شەق ببێو و ڕووی خۆی نیشان دا کاتی کازیوە
بـە ئـاوی چـاوی خـۆم بـاخی ژیـان عـومرێکە دەیـدێرم
لە داری ئـــارەزووم ئـــێستا بـــەرێکی تـــازە نـــەچنیوە
گەر ئێستا شێعری (سەیید) تامی شـیرینی دەدەن گـیانە
هەزاران تاڵ و سوێری و ڕەنجی فـەرهادم لە سـەر دیـوە

# پەیک

بریا پەیامەکەی من وەک پەیکی بای سەبا با
لە جوابی کاک عومەردا ئەم شیعرە بۆی برا با
پێت وانەبێ کە (بابا) باییکە لەو کتێبە
(بابێ) نەبوو لە فەسڵا فەسڵێ نەبوو لە (باب)ا
بابایەکی بێ بابا هەر چەن خوا بەها (با)
ئەو گونبەزەی کە تۆ دیت (با) بوو لە نێو (حوبابا)
تۆ بۆ چی لێی ئەترسای لەو شێری بێ دم و یاڵ
شێر بوو کە توانی بایە کتکێکی ژێر (عەبا) با
هەر ئەم کونە و کونی بوو پۆلێ وە دووی ئەکەوتن
ئاوام ئەهاتە بەر چاو مشکێک کە وا بە (با) با
سەید و مەلا و مەشایخ نابێ لە چت بترسن
خراپی تێ گەیشتووی هیچی نەبوو نە (بابا)
پێم خۆش بوو ئەم قسەی تۆ هەر کەس خوای بەهابا
با خواردنیش نەزانێ ئەیخا بە مل (کەبابا)

٦٤/٨/٢٧

# لە جوابی کەمالْدا

تۆ کە پێت وایە زنەی عیلم و ئەدەب زاوەتەوە
هونەر ئەو جۆرە کە پێویستیە نەژیاوەتەوە
کێ هەیە قەدری هونەرمەندی بزانی ئەورِۆ
ئەوە گیان سەختی‌یە ئەو تۆزە ئەگەر ماوەتەوە
هیچ هونەرمەندێ نیە تاکوو لە دەس بێ هونەران
حەقی ژێر پێ نەبووە رەنجی نەچەوساوەتەوە
بێ کفن دەمرێ هونەرمەند و کەجی تابووتی
بە دوو سەد سلسلە و فلفلە رازاوەتەوە
هەستی جوانی تۆ برا جێگەیی تەحسینە کەمالْ
وەکوو تۆ ئێستە کە بیرێ لەوە نەکراوەتەوە
کاک کەمالْ بۆ چی دەلێّی بوومە ئەسیری قافیە
پیاوی ئازا بە پەت و میخی نەبەسراوەتەوە
گەر وەبەر دلْ دەکەوێ شێعری من ئەورِۆ ئەوەیە
گەوهەری ئەشکە بە خوێنی دلْم ئاو داوەتەوە
تازە دەستت بە قەلّەم گرتووە زمانت بە قسان
قەلّەمت بۆیە لە چەن جێگەوە لەرزاوەتەوە
زۆر بلێّ و وەک چەقە بیجوورەوە کاوێژی بکە
چەقەکەت خۆش دەبێ ئەو وەختەکە جووراوەتەوە

# دەهۆی دوژمن

ئەشکی خوێنینم کە ئالاون بە سەر موژگانەوە
وەک سەری مەحکووم بە سەر نیزەی ستەمکارانەوە
خونچە پشکووتوون ئەگەر ئەورۆ بە لوتفی شەونمە
وا دەبینم پێکەنینی خۆم بە دم گریانەوە
من لەگەڵ ئەو مەستە پەیمانی دروستم بەستووە
ئەو بە سەد پەیمان شکێنی من بە یەک پەیمانەوە
ئەشکی من وەک کۆتری هێلانە لێ تێکچوو دەچێ
یا لە سەر سووانەی مژۆڵە یا بە ڕێگە وبانەوە
سیلە چاوێکی نەدامێ خۆ دڵی ئەمنی شکاند
شیشەکەی سالم دەمێنێ قەت بە دەس مەستانەوە
نیوە گیانێکم بمێنێ بەسمە تا دێمە حوزوور
تا دوو سەد گیانت بە قوربان کەم بە نیوە گیانەوە
هەرچی دەیبینم درۆی دوژمن دەهۆی نامەردی یە
کەللە پووک تا بیکوتی بای دەچێتە نێو هەمبانەوە
من لە مزگەوتێ دەهاتم پێم دەڵێ دوژمن (سەید)
ڕێگەکەی کەچ کردووە من دێم لە لای مەیخانەوە

٦٤/٩/١٥

# بەهار

کـاتی بـەهارە جـوانـە چـرۆی سەرچڵی چنار
پـیران جـحێڵ دەکـاتەوە لوتـفی هـەوای بـەهار
عــاشق دەبـا هـەڵاڵە و گـوڵ پـڕ بـە بـاخەڵی
بـولبول دەبـا لە لالە و سـونبول بـە کـۆڵ و بـار
یەک رەنگ و سەوزەپۆشە هەموو دەشت و کێو وکەژ
فــەرقی نــیە لە بــەینی سـیا کـێو و لێـڕەوار
شــەونم دەخـاتە بـاوەشی گـوڵ گـەوهەری ئـەوین
لالەش دەبــێتە بــووکی بـەهار و شــەمی مـەزار
سوێسنە و هەڵاڵە لالەیی سوور ون دەکەن رکێف
هــەر وەک پـیادە وایـە لە دەشـتا لە دوور سوار
تا چـاو هـەتەر دەکـا گـوڵ و گـیا سـروەیی نـەسیم
ئـارام دەیـانشەکـێنێ لە پــێ دەشت و بـەر بـنار
چــەن جــوان و دڵرفـێنە چـرۆی تـازە دەر دەکـا
هـــەروەک نـەمامی تــازە لق و پـۆپی پـیرەدار
هەرکەس بەدەستودیاری یەبەمجێژنە (سەیید) یش
چــەپکێ گـوڵی وەنـەوشە بـە شـێعرێکی ئابدار

## دووبەیتی

## بۆ ماموستا مەلا غەفوور حافیزی مەهاباد

چاو خۆشەویستە گەرچی لە لای خاوەنی نەزەر
نابێ بە بێ بەسیرەتی دڵ لەززەتی بە سەر
پێم خۆش بوو کوێر ببام و بەڵام وەک مەلا غەفوور
ڕۆشن دڵ و ئەدیب بم و خۆش زەوق و باهونەر

## تەخمیسی مەلا غەفوور لە سەر ئەو دووبەیتی یە

پیاوێکی بەرز و زوبدە لە سەیدانی موعتەبەر
پسپۆڕی فەننی شێعرە لە ورد بینییا ئەبەر
ئەم فکرە چەندە بیکرە کە لەو مەغزە دێتە دەر
چاو خۆشەویستە گەرچی لە لای خاوەنی نەزەر
نابێ بە بێ بەسیرەتی دڵ لەززەتی بە سەر
ئەو خێوی مووقەلەش و هەستی پڕ لە نوور
غەواسی بەحری بینش و ئیدراکی بێ سنوور
بڕوانە ئارەزووی دڵی بێگەردی وەک بلوور
پێم خۆش بوو کوێر ببام و بەڵام وەک مەلا غەفوور
ڕۆشن دڵ و ئەدیب بم و خۆش زەوق و با هونەر

## لەجوابی دەردەدڵێکی مەلا غەفووردا

هیچ دەزانی چەندە ئەم دنیایە پیسە و نەکبەتی
قەت لە دڵ خۆتی مەخە داخ و پەژارە و حەسرەتی
چاوی دیدارت نیە چاکەی لەگەڵ کردووی خودا
خۆزگە بەو رۆشن دڵەی نابینێ دەرد و مەینەتی

* * *

## دووبەیتی

ئەوی بێ چاوە خودا بێ حەد و ئەژماری دەداتێ
هونەری جوان و دڵی رۆشن و وشیاری دەداتێ
گەرنەبینی چەمەنی سەوز و گوڵی سوور و چیای شین
هەر لە باخچەی دڵی خۆیدا گوڵ و گوڵزاری دەداتێ

* * *

یا شێخ چ باسە تاوێ لە لام ئۆقرە ناگری
تۆ بەرقی شاری یا خۆ سپەندی سەر ئاوری
گەر خانەقا بەهەشتە، سەرای من جەهەننەمە
هەر ماڵی خۆتە هەر چی درەنگ بێی زوو رابری

* * *

خەوێکم بوو کە تۆم تێدا دەدی من
ئەویشم چوو لە بەر بەختی بەدی من
بە چادر زولف و رووی پۆشی و کوتم پێی
شەو و رۆژم نەما چ بکەم ئەدی من

* * *

دەپرسی بۆ چی وا دڵ تەنگە سەیید
زمانی بەستووە بێدەنگە سەیید
دەڵێم با هەر ئەمن ماچ کەم دەمی تۆ
دەڵێی چاو چەندە بەرچاو تەنگە سەید

* * *

ئەو کچە کوردە کە هیچ عەیبی نیە
حەیفێ هەمدەم نیە زۆر دەمدەمی یە
کە بڵێی عەیبی تێیا بێ نیەتی
نوقتە زەعفێکی کە بی بێ دەمی یە

* * *

هاژەی بای وەعدە دیسان هاتەوە
لە نێو شاخ و کێو دەنگ ئەداتەوە
خونچە لە باتی ئەوەی گوێ بگرێ
وەک شیرە خۆرە دەم ئەکاتەوە

* * *

رۆژ باش بۆ کەسێک بکا لە رۆژدا
بۆ کارێکی باش جارێکی تەلاش
هەنگاوێک لە رێی گەلدا هەڵگری
ئەم جارە باشە پێی بڵێی رۆژ باش

* * *

ئەوەی دەمویست خودا بیکا عەتا پێم
ویسالێ بوو، ئەویش نەیدا خودا پێم
بە گەرمی لێم دەپرسی رووی دەپۆشی
بە ساردی جوابی داوە رووی نەدا پێم

* * *

ئـــەگـــەر فـــرمێسکی مـــن نـایە بـە لافـاو
مــــــەزانــــــە مـــن نـــەسووتاوم نـــەماوم
کـە دیـم زولفـی بـە چین کـەوتۆتە سـەر یـەک
گـــــرِی کــــەوتۆتە کـــاری ئـــاوی چـــاوم
* * *
زولفت کـــــە بـــە حـــەلقە دێـــتە خـــوارێ
هـــەر جـــارە بـــەشێکی یـــا بـــە یـەکـجار
وەک حـــــاڵی دڵی مـــــنە پـــــەرێشان
وەک بـــەختی رەشـــی مـــنە ســـەرە و خـوار
* * *
جـــــــەمعە لە وجـــــــوودی نـــــــازەنینا
گشت نـــــوکتەیی ورد و رەمـــــزی شـــیرین
ئـــــەو زەردەخـــــەنەی دەمـــی پـــچووکی
وەک جـــــوملەیی ئـــیبتیدا بـــە ســـاکـــین
* * *
لێـــفەی ســـەری مـــن ســـێبەری عـــاسمانی شـــین
ژێـــر راخـــەرەکـــەم عـــەرزی خـودا پـان و بـەرین
چـــاوم هـــەیە تـــا بـــە عـــەیبەوە دامـــپۆشێ
گـــوێچکەم هـەیە جـار و بـارە دەیکـەم بـە سـەرین
* * *
ئەم جیهانە بێ سـووباتە بـێ ستەم گـەر نـاسرەوێ
گەر یەکێ دەروا یەکی دیکـەی لە جـێگەیدا هـەیە
عاقیبەت سایەی لە سەر دنیا نەما داس و چەکـوش
داسی رووسی رۆیی ئەمما چەکوشی ئەمریکا هـەیە
* * *

## تاک بەیتی

قاسپە قاسپی کەو لە کۆساران نیشانەی شادییە
گەرلە چوار چێوەی قەفەسدا بێ و بخوێنێ شیوەنە

* * *

ئەو هەورە رەشەی وا سەری کێوانی بە تەم گرت
چون رزقی خودای پێوەیە ماتەم دەڕەوێنێ

* * *

کەللەی زل و بە تاڵە ئەگەر زۆر دەڵێ قسە
لۆمەی مەکەن کە گومبەزی چۆل دەنگ ئەداتەوە

* * *

گەرچی پیری لە منی گرتەوە ئەلماسی ددان
دڵەکەم خۆشە خیلال مننەتی پووشێکی نەما

* * *

گەر دوعایی دڵ شکاوان ئەی خودا گیرا دەبێ
من دوعام وایە کە دووبارە دڵم بشکێتەوە

* * *

نامەوێ من رووی تماشاکەم نەکوو بۆ دەفعەیەک
وەک لە ئاوێنەی خەیاڵم دا دیارە وا نەبێ

* * *

هەموو جوانی‌یەک لە سەر ئەو خاتیمەی دێ
وەکوو ئەلحەمدە ئاخری دێ بە ئامین

* * *

چـۆن دەبـا بـاری لەشـی ئەو کـەمەری باریکی
کـەڵ بـە مـوو بـەندە لە قـانوونی مـەلاحەت لەودا

* * *

من کە نوێژی بۆ ریام پێ کـوفرە دووری لێدەکـەم
جێی لە دڵدا چۆلە هەر وەک باوەشی مێحراب بە تاڵ

* * *

دڵ وەکـوو مـاڵی کـەوان پـاکـە لە کـینە خـاڵییە
تیری تـانەی تـۆ لە مـن هـەر بـۆیە نـاپێکێ نـیشان

* * *

هەر چەندە کە پەروانە بە شەم باڵ و پەڕی سـووت
خۆ ئـەو شـەمە قـەت وەک دڵی پـەروانـە نـەسووتا

* * *

هەمیشە چینی زولفی نایەڵێ من رووی تـماشا کـەم
تماشای بەختی رەش کە چۆن گری کەوتۆتە کاری من

* * *

چاو وگوێم چـوون و ددانـیش وردە وردەهـەڵوەری
داری پیری گەر وەبەرهات هەردەمەی دێنێ بەرێک

* * *

تانەکەی سەرچاوی من هەردەم بەئەسرین زیاد ئەبێ
قەڵپەزەی ئاوە لە هـەڵدێران کـە کـەف دێـنێتە روو

* * *

نەسیم کەم باوەشێنی زولفەکەی کە دڵ لەوێ دایـە
ئەتۆش وەک مایە فیتنە ئاوری دڵ خۆش مەکەچیدی

* * *

لەگەڵ یارانی دڵسووتاوی خۆت یەک دڵ بە دوورەنگی
لە لالەش من قەبووڵ ناکەم دڵی وەک من نەسووتابێ

* * *

هیچ دەزانی سەروی ناز بۆ چی لە گوڵ بالاترە
سەر بلندی ئەو لە گوڵشەندا لەبەر ئازادی یە

* * *

قەت نەبوو شێعر و هونەر دەرمانی دەردی دڵ بکا
خەزنە خۆ ویرانەکەی خۆی ئاوەدان ناکاتەوە

* * *

ئەوەندەی تێدەکۆشم نایگەمێ بیگرمە نێو باوەش
دڵم خۆشە بەوەی وەک سایە هەر هاوسایەیی تاوم

* * *

گوڵ لە شاخەی خۆی جیا کەی تازە ئۆقرە ناگرێ
گەر لە باخەڵدا بێ پێویستە یەخەی لێ دابخەی

* * *

ڕۆژگاری ڕەش بە ڕۆژ و شەو لە دووی بەختی منە
دز هەمیشە چاو لە دووی داهاتی خەو لێکەوتووە

* * *

ژیانم مەینەتە هێندەم بە تاڵی ڕۆژگار دەڕوا
ئەگەر ساڵێک لە عومرم دەگوزەرێ جێژنێکی بۆ دەگرم

تەقەللای زۆر ژیان موشکیل دەکا تەیری لە داو کەوتوو
هەتا باڵ لێک بدا زیاتر لە داودالێ پەڕ وباڵێ

* * *

لالەیــە کــاتی بــەهاران مــینەتی بــاران دەکێشی
وشکـە پـووشی کـەژ لە بـارانـی بـەهاران بـێ نـیازە

* * *

بــە کــوڵ گــریام کــە دیــم رووی خــۆی دەپـۆشێ
کــــــــە رۆژ گــــیرا بــــەڵێ ئـــەستێرە هـــەڵدێ

* * *

نـــوکی قــــەڵەم نــەبێ خــەمی دڵ چــارە نــاکــرێ
نـــــەشتەر نــــەبێ دمـــەل بـــە چـــەقۆ پـــارە نـــاکــرێ

* * *

ئەجەل هاتوو نەمردم تاکوو رزگار بم لە دەس مەینەت
زەمـــانە ئــەمنی بــۆ دەرد و بـــەلاّ هـێشتۆتەوە جـارێ

* * *

گــەر نــیمە چــەمەن بــاسوو قسـەم زۆرە لەگـەڵ دڵ
بـــۆ تـــــوتی حـــەبسی پـــەڕی ســەوزی چــەمەنیکە

## ئەسیر

نازدارەکەم لە ئاوێنەی دڵی مندا
بە غەیرەز وێنە جوانەکەت
هیچ گوڵێک تێیدا ناپشکوێ
بۆیە باخچەی دڵی پەرۆش
بۆتە ئاوێنەی باڵا نوێن
بۆیە دڵی بێ قەرارم
لە هیچ لا ئۆقرە ناگرێ
* * *
تۆ بڵێ ئەو ڕۆژە کەی دێ
دەستە نەرم و ناسکۆڵەکەت
لە نێو دەستی خۆمی بگرم
گەرمی پەنجەکانی جوانت
بگەڕێ لە نێو لەشمدا
ئەو قژە لوول و پڕ چینەت
ببێتە تۆقی ئەستۆی من
تا دەمرم هەر لە داوتا بم
ئەسیرت بم
بۆ تۆ بمرم بۆ تۆ بژیم
* * *

پێم بڵێ ئەو ڕۆژە کەی دێ
وەک لالەییکی دڵ سووتاو
بە داخ و تاسەی دیدارت
سەر لە سەر داوێنت دانێم
کەم کەم لە ئاوری ئەویندا
بسووتێم و بتوێمەوە
پێم بڵێ ئەو ڕۆژە کەی دێ

٧٢/٩/١٥ سەیید

# جەفای زەمانە

جەفا و جەوری زەمانە و دەردی پیری وای لە پێ خستم
مەگەر تاڵێکی زولفت بێتە یاریم بۆ عەسای دەستم
نەسیمێکی وەفای پێویستە تاوانەی سرشکی من
لە سەر دەریای هومێدم یەک بخا مەوجی خەم و هەستم
لە بادەی چاوی تۆ هەرچەندە نەشائێکم نەدی جارێ
نیگایێکت بەسە بۆ بیری وریا و بۆ دڵی مەستم
لە پێ کەوتووم و پیرم دەس بە داوێنی چ جوانێ بم
وەفادارێکی دێرینە نەبێ کێ بیگرێ دەستم
لە گوڵزاری دڵا بوون کاتەکانی ئەو شەوەی دیمی
هەمووم کۆکردەوە بۆرۆژی خۆی وەک چەپکە گوڵ بەستم
بە نیونکی ئەمەل شیم کردەوە هاوریشمی بیرت
بە دەستی دڵ چنیم و تار و پۆکەی تاڵ بە تاڵ رستم
تریفەی مانگەشەو باخچەی دڵی وەک لالەزار لێکرد
دەپشکوون جاربەجار(سەیید)شکۆفەی شێعروهەڵبەستم

سەیید ٧٢/٨/١

# دەعوەت

براکەم کاک جەمیل بیرت دەکەم بێحەد و ئەندازە
وەرە دەرکـی دڵم بۆ خۆشەویستان رۆژ و شەو وازە
دڵم بەینێکە غەم دای گرتووە وەک ئاوری داغە
مەگەر تۆ ئاوی پێداکەی بە شێعرێکی تەڕ و تازە
بە تاری زولفی یار بەندە دڵم بۆیە دەناڵێنێ
ئەگەر سێ تارەکەی نەپسێ نەواکەی زەمزەمەی سازە
ئەگەر چی ماڵەکەم کۆنە و پچووکە ماڵی دڵ ئاوا
بە زاهیر تەنگ و بێ ئاوایە ئەمما دەست و دڵ بازە
براکانت لەگەڵ خۆت بێنە بۆ راز و نیازی دڵ
کەمەحفەل شەمعی پێداویستە شەمعیش مەحرەمی رازە
بە دوودی سینەما دیارە کوڵیوە ئاوری جەرگم
منەت ناکەم لە سەر تۆ گەر بڵێم دوکوڵیوەکەم سازە

# عیرفانی وەفایی

وەفــــایی عــــاریفی حـــەقولیەقینە
ســــەراپــا عــیشقە ســووتانە ئــەوینە
دڵی هەم شەمعە هەم پــەروانــە بــۆ شــەم
بــە یــەک جــێ شــەمع و پــەروانــە ببینە

* * *

وەفــــایی بـــولبولی زارە و نـــەزارە
نــموونەی عــیشقی پــاکــە لەم دیــارە
لە هــەر بــاغێک گــوڵێکی تــازە شین بــێ
نـــــیشانێکی وەفـــــایی لێ دیـــارە

* * *

لە بــەر عــیشقێکی پــاک بــۆتە هــەوایــی
هــەموو زەڕڕەی وجــوودی بــێ جــودایــی
لە هەر جێ باسی عــیرفان و ئــەدەب بــێ
دەڵێن هــەر وەک وەفــایی وەک وەفــایی

* * *

وەفــــایی عــــاشقی دڵ پـــڕ لە رازم
بــە تــۆوە بــەش بــە حــاڵی خــۆم دەنــازم
ئەتۆ و رازو نــیازی خــۆت لەگــەڵ خــۆت
مـــــن و دەردی دڵ و راز و نـــیازم

* * *

هەموو دیوانەکەت سرڕی موبینە
نوکاتی حیکەمەتە یا رەمزی دینە
هەموو شێعرێکی نەقشێکی دەروونە
هەموو بەیتێکی ئاوێنەی ئەوینە

* * *

ئەگەر گیرۆدەیی زولفێکی خاوی
وەکوو مورغی قەفەس کەوتوویە داوی
منیش کەوتوومە نێو هەودای تەشی رێس
منیش سەردەر گومم وەک تۆ لە تاوی

* * *

ئەتۆی دڵسۆزەکەی دڵ پڕ لە هەستم
بە نەشئەی شێعری تۆ وشیار و مەستم
وەکوو تۆ عاشقی جوانی سرشتم
بە وشیاری و بە مەستی دەیپەرستم

* * *

کەس ناڵێ غەریبی عیشق کێیە
وەفایی کێیە گڵکۆکەی لە کوێیە
لە سەحرای مەکەدا هەر بۆنی گوڵ دێ
بەوەم زانی کە گڵکۆکەی لەوێیە

* * *

ئەگەر پێت خۆشە تۆ ناڵەی جودایی
زەبووری داودی نەغمەی غینایی
وەرە گوێ بگرە بۆ بەزمی ئەدیبان
بە دەنگی ماملێ شێعری وەفایی

* * *

بە رۆژ مەیگێڕی جەمعی عاشقانە
بە مەیخانە و بە مەی دەگری بەهانە
بە شەو تێکەڵ بە کۆڕی عارفانە
کەچی هاومەجلیسی بەزمی ئەوانە

* * *

هەمیشە موبتەلای قەهری خودایی
گرفتاری جەفای نائاشنایی
بە دەرد و مەینەتی دڵ موبتەلا بێ
ئەوەی بۆ تۆ وەفایی بێ وەفایی

* * *

لە دەریای مەعریفەت کەشتی سوباتی
چرای روونی لە رێبازی وڵاتی
وەکوو ئەستێرەیێکی جوان و رۆشن
لە ئاسۆی شێعری (سەیید)دا هەڵاتی

* * *

سەیید ٧٣/٨/١٥

١

## بۆ ئازادی خۆشەویستم

ئازاد ئەی رۆڵەی رەزا شیرینم
پێم خۆش بوو کوێر بم ئاوات نەبینم
نەخۆشی‌یەکەی تۆ دەستی منی بەست
ئەتۆی لە پێ خست ئەمنی لەپێ و دەست
ئەمنیش بە لاوی وەک‌تۆم بە سەرهات
هەردووکمان وەک یەک ژین و بەسەرهات
دەردی تازەی تۆ دەزانم چۆنە
بۆ من ناسووری برینی کۆنە
لە خوا دەخوازم ببێ شیفایاب
نەبیە وەباڵی ئەستۆی دای وباب

# بۆ حاجی سەیید جەمیل هاشمی

براکەم کاک جەمیل بیرت دەکەم بێ حەدد و ئەندازە
وەرە دەرکــی دڵم بـۆ خـۆشەویستان ڕۆژ و شـەو وازە
دڵم بـەینێکە خـەم دایگـرتووە وەک ئـاگری داغـە
مەگەر تۆ ئاوی پێدا کـەی بـە شێعرێکی تـەڕ و تـازە
بـە تـاری زولفـی یـار بـەندە دڵم بـۆیە دەنـاڵێنێ
ئەگەر سێ تارەکەی نەپسێ نەواکەی زەمزەمەی سازە
ئـەگـەرچـی ماڵەکـەم کـۆن و پـچووکە مـاڵی دڵ ئـاوا
بە زاهیر تەنگ و بی مەئوایـە ئـەمما دەستوو دڵ بـازە
بـراکـانت لەگـەڵ خـۆت بـێنە بـۆ ڕاز و نـیازی دڵ
کەمەحفیل شەمعی پێداویستە شەمعیش مەحرەمی ڕازە
بـە دوودی سـینەما دیـارە کـوڵیوە ئـاگـری جـەرگم
منەت ناکەم لە سەر تۆ گەر بڵێم دۆکـوڵیوەکـەم سـازە
سـەیید هـەر چـاوەڕوانـی ڕێگـەتانە زوو وەرن کـاکـە
ئەگەرشەو زۆردرەنگ‌بێ‌وەختی خەو دێو کاتی خەمیازە

# جەفای زمانە[؟]

جـــەفای جــەوری زەمـــانە و دەردی پـیری وای لە پـێ خســتم
مـــەگـــەر تـــایێکی زولفت بـێتە یــاریم بـۆ عــەسای دەســتم
نـــەسیمێکی وەفـــای پـــێویستە تـــا دانـــەی سـرشکی مــن
لە ســەر دەریــای هــومێدم یــەک بـخا مــەوجی خــەم و هــەستم
لە بـــادەی چـــاوی تــۆ هــەر چــەندە نــەشئێکم نــەدی جــارێ
نـــــیگاێێکت بــــەسە بــــۆ بــیری ورد و بـــۆ دڵی مـــــەستم
لە پــــێ کـــــەوتووم و پــــیرم دەس بــەداوێــنی چ جــوانــێ بــم
وەفـــــادارێکـــــــیدێرینە نـــەبێ کــێ بــیگرێ دەســــتم
بـــە نـــینۆکی ئـــەمەل شـــیم کـــردەوە هـــاوریشمی بـیرت
بـــە دەســتی دڵ چـنیم و تــار و پــۆکەی تـــاڵ بــە تــاڵ رســتم
تـــــــریفەی مــــانگەشەو بــــاخچەی دڵی وەک لالەزار لێکـــــرد
دەپشکــوون جــار بــە جــار ســەیدشکۆفەی شێعر و هــەڵبەستم

# پـــاوە

بـــەهەشتی جـــوانـــی بـــێ هـــاوتایە پـــاوە
گـــوڵی بـــاغی ئـــەدەب ئـــارایـــە پـــاوە
لە هـــەر گـــوڵ دەســـچنێکی لایـــە پـــاوە
لە ســـایەی تـــۆوەیە ئـــەم مـــایە پـــاوە
لـە سـەرمان کـەم نـەبێ ئـەو سایـە پـاوە
نـــە مـــیرزا قـــادری شـــۆخ و هـــونەر وەر
بـــە تـــەنیایی وەکـــوو گـــەنجێکە گـــەوهەر
ئـــەدیب و شـــاعیر و زانـــا و بـــە جـــەوهەر
هـــەموو لاوانـــی ئـــەم نـــاوە ســـەراســـەر
هونـەرمـەنـدن کـە جێـی هیـوایـە پـاوە
وەرن یـــاران وەکـــۆ بـــن کـــەم بکـــەن شـــین
وەبـــیر هـــاتوونەوە یـــارانـــی دێـــرین
حـــەسارێک بـــوو ئـــەدەب بـــێ هـــەژگو پـــەرژین
بـــەڵام ئـــیستا قـــەڵای ئـــامادە بـــۆ ژیـــن
لـە چـاوی بەد بە دوور کەی خـوایە پـاوە
لەبـــەر ئـــەغیار ئـــەمن هـــەرگیز نـــەناڵم
لە دەس یـــاران بـــەڵام کـــافر بـــە حـــاڵم
وەکـــوو لێـــم حـــاڵیە و دێـــتە خـــەیاڵم
لە مـــەولا نـــاتوانـــێ زۆری زاڵم
بـــە تـــاڵانـی بـەرێ سـەرمـایـە پـاوە

سەراسەر شۆر و عەشقە ئەم دیارە
لە هەر لا جیلوەیی جوانی دیارە
ئەگەرچی لەت لەتە دڵ پارە پارە
لە عەشقا ئەم نیشانەش ئیعتیبارە
کە رەسمی عەشق بازی رایە پاوە
مەڵێن پاوە وەکوو جاران نەماوە
وەکوو لالە هەموو جەرگی سووتاوە
هەموو جەرگی منە لەت لەت کراوە
هەتا رۆڵەی گەلت مابێ بە پاوە
بناغەی قایمە ئەم پایە پاوە
بەڵام پەی پۆلی لاوانی ئەویندار
هەتا پوختە نەکا ئاور دڵی زار
نەبێ تا دڵ بە دەردی خەم بریندار
ئەتۆ نازانی زولفی یاری غەددار
بە پێچە خاوە یا هەودایە پاوە
ئەگەر چی من لەپێ کەتووم لە دەس چووم
لە ئاوات و ئەمەل دوور و نزیک بووم
بەڵام هەر جان فیدا و دڵ سۆزەکەی زووم
هەتا ماوە حەیاتم تاکوو دەبزووم
سەری سەیید لە رێی تۆ دایە پاوە

ڕەبەق چوار مانگە کەوتووم و لە سەر جێم
لە بەر ئێشی لەش و دەردی هەموو جێم
نە هەر دەستی شکاو ناگاتە ئەستۆ
وەباڵی دەست و شانیش کەوتە سەر پێم
لە پێی خستم زەمانە وەک هەموو جار
برا چ بکەم دەبی رابێم و پێ بێم
لە ڕێی ژینا ژیانم ژانە ئەورۆ
هەموو کۆسپێکی ناخۆش کەوتە سەر ڕێم
بە ئاوی چاوما دیارە وەکوو شەم
لە سەر پێیەک هەتا ڕۆژێ دەسووتێم
حەقیقی چۆنە ئەوساڵ لێت نەپرسیم
لە بێ لوتفیت برا ئەو جار دەترسێم
لە ئەحواڵت ئەمن خۆ بێ خەبر نیم
برا بۆ لات زەمانێ بێ خەبەر دێم
لە پێ کەوتووم و مەحرومم لە دیدار
بە سەر دێم من ئەگەر نەکرا بە پێ بێم
سەیید لە خودای دەوێ دیداری یاران
قەبووڵی کا ئەگەر ئەمجا خودا لێم

# توحید

خدایا گر چه خود مشکل نمایی ندانم جز تو من مشکل گشایی
دلی کز پرتو مهر تو خالی است اگر خورشید باشد نقطه خالی است
خدایا مهر خود در دل فروزم که گردم شعله و یکجا بسوزم
چو تابد ذره‌ای از مهر جانان بهر دل گردد او خورشید تابان
من آن خواهم کنم چون ذره پرواز بسوی مهر تو راهی کنم باز
گنه بار مرا سنگین کند بیش بسرعت تا که بردارم قدم پیش
گنه از شوق عفوت میکنم باز کنم تا خویش را با دوست همساز
ز عفوش آنچنان دل در خروشم که آنرا با دو عالم کی فروشم
مرا با تو ره سوداگری نیست که ازسودا غرض حور وپری نیست
عبادت را بها باغ ارم نیست اگر زهدی روان نبود ارم چیست
ترا میخواهم از دنیای هستی همینم بس من از یکتاپرستی
دلم از سوختن پروا ندارد که این حالت فقط پروانه دارد
دلم‌تنگ‌است‌چون باعشق‌زاداست اگر گویم سر مویی زیاد است

به عشقش دادم ار سرمایه‌ای بود
که این سوداست سید را دهد سود

# عید قربان

روز قــربان پــرتوی از جـلوه جـانانه بـود
در حـریم کـعبه جـز آن جـلوه‌ها جـانانه بـود
در رهش جان باختن از هر کسی کی ساخته است
گــر تــو اسـماعیل گـویی مـظهر جانانه نـبود
آشـــنای هـمچو ابـراهـیم از خـود بگـذرد
آشـنای عشـق بـا دل بـند خـود بیگانه بـود
بـعدها ایـن کـلبه خـاکـی ز نـور احـمدی
کـعبه امـال شـد روزی کـه یک بـتخانه بـود
در حـریمش مـحرم اسرار کس نـتوان شـدن
چـون مـحمد وارث ایـن خـانه و کـاشانه بـود
آسمان اکنون که سر بـر آسـتانش سوده است
خـانه را ایـن مـنزلت از فـرّ صاحبخانه بـود
ذات پـاک او حـقیقت بـود و حق بـود واز او
مـحو شـد هـر چیزباطل بـود یـا افسانه بـود
جسم بـی روح صنم جـبر زمـان بشکسته بـود
آنـچه بشکسـتی مـحمد روح جـبارانـه بـود
حاجیا دانی که مـقصود از طـواف کـعبه چیست
یـعنی شـمع خـانه را بـاید دمـی پـروانـه بـود

در صفا و مروه پیمان بر سر زمزم مبند
زمزمی جو کو محمد را بیک پیمانه بود
نفس را سنگی بپا انداز در راه خدا
رجم شیطان حاصلی گر داشت رنج شانه بود
سیل عشق او خراب آباد دل آبادکرد
این صفا بین سیل خود مجذوب یک ویرانه بود
ای صبا چون بگذری بر آستانش عرض کن
سید دل خسته هم خاک ره آن خانه بود

# اتحاد

بیا برادر من بهر این برادر خویش
ز مهر و لطف تو مرهم گذار بر دل ریش
همیشه لنگ بود کاروان تک رو راه
باتفاق رسد کاروان به مقصد خویش
بیا ز لطف مرا دوستانه یاری کن
که دشمنان همه گرگند در قیافه میش
فریب دشمن نا اهل را نخور هرگز
بظاهرت چو دهد نوش باطنش همه نیش
زمانه همرهی ما نمیکند، نکند
چه باک گر تو بگیری ره وفا در پیش
چو آب دیده بخون جگر بیامیزد
شود بگونه دریا ز قطره‌ها کم و بیش
چو هست مصلحت از اتفاق نتوان کرد
خلاف مصلحت خویش شخص دور اندیش
مرا منفعت اندر وفاق با هر دین
تراست مصلحت از اتفاق با هر کیش
زمهر همرهی کاروان سید کن
بیا و پنجه‌ای بر دف بزن تو هم درویش

# شوخی با یک همکار ثبتی

الا همکار ثبتی ناظر اعمال سر دفتر
خدا را دوستان خویش را دریاب گهگاهی
تو با من مهربانتر باش در این بیوفا دوران
که بی ریب و ریا نازت کشم والله وباللهی
گنه گر پول پارو کردن سر دفتران باشد
چه غم روزی چو افزون شد خورد هم مرغ هم ماهی
چرا سر دفتر ار پایش بلغزد سرنگون گردد
معلق میشود در دادگاهی گاه و بیگاهی
خطا گر پر کاهی باشد از وی میشود کوهی
وگر کوهی کند خوبی ندارد جلوهٔ کاهی
ولیکن ثبتیان را اسم اعظم هست در گردن
که محفوظاند از هر بازپرسی یا زوا خواهی
اجل چون آشتاب آمد ولیکن با شتاب آمد
ورق زد برگ زرین دفترم چون کاغذ کاهی
بقصد جان و مالم آمد و تیرش بسنگ آمد
که نگذارد مرا در جسم جانی در بساط آهی
ولی برگ سیاه دیگران را ماست مالی کرد
چنان گویی یمانی را نبوده در حبش راهی
بلی قانون بتار عنکبوتی فی‌المثل ماند
ضعیفان را چنان پیچد که دام و تورها ماهی

قــوی زنــجیر بــاشد بگســلد چـون تـار مـو زیـرا
که او را هست در هــر بـارگاهی خـیمه خـرگاهی
مرا   این غم کشد کاین خـانه امـید مـا چـون شـد
کـه هـر نـاباب را بـاشد در او بـابی در او راهـی
گــهی بـا چـاپلوسی مـیکند راهـی بـدلها بـاز
وزان ره مــیکند بــهر رفــیقان چـاله یـا چـاهی
بـراه راست ایـن نـاهمرهان یـا رب هـدایت کـن
کـــه سـید را نـباشد کـینه‌ای از هـیچ هـمراهی

# تهران سال ۳۲

به تهران مردمان صاحب علم و هنر دیدم
کز اینان ملک ایران سربلند و مفتخر دیدم
بهر محفل نسیمی از صفای جان و دل پرور
بهر مجلس شمیمی از گل فضل و هنر دیدم
همه تهرانیان را مهربان و زنده دل دیدم
بهر کو از نشاط و شور مملو رهگذر دیدم
بهر جا لاله و گل اوفتاده توده در توده
به پای هر گلی از بلبلان خسته سر دیدم
بهر گلخانه‌ای از دختران گلفروش آری
ندیدی غنچه‌ها، در دست گل، من بی شمر دیدم
شدم در اشتباه از شوق تا بوسم کدامین را
دمی کان زلف مشکین چنگ اندر نیلوفر دیدم
اگر چه شهر تهران مظهر نور و صفا باشد
ولی بس تیرگی را در میانش مستتر دیدم
بزیر آن عمارت کاسمانش زیر پا دارد
هزاران بی کلاه و کفش را از پا و سر دیدم
بهر جا خسته و نالان یتیمی بینوا گریان
ز سوزش آتشم بر جان ز اشکش دیده تر دیدم
ز کار افتاده‌ای در گوشه‌ای از یادها رفته
چسان محزون و نالانش غمین ومحتضر دیدم
هزاران کودک آواره از آغوش مادرها
هراسان اشک ریزانش بجویای پدر دیدم
کسی را غرق شادی در کنارش باده و معشوق
یکی را در بغل زانوی غم شب تا سحر دیدم

# چادر عفت

ای کـه بشکسته‌ای از جـور و جـفا خـود دل مـا را
بـاز مـا را تـو بـیاد آر دگـر بـار خـدا را
زلف او مشکـل مـا بـود چـو پـیچید بـچادر
کـرد پـیچیده‌تر از اول خـود مشکـل مـارا
عـنبرین زلف تـو هـر چـند کـه پـوشیده بـماند
بـاز غـافل نـتوان کـرد از او بـاد صـبا را
روی پـوشیده و مـردم بـه تـماشای تـو مشغول
مـاه را هـاله چـو گـیرد بشـود مـنظره آرا
پـرده پـوشی بـود ایـن چـادر و دانـند خـلایق
آخـر از پـرده بـرون آرد ایـن روی و ریـا را
او کـه بـر دور خـود از چـادر دیـوار کشـیده است
تـا چـه در پـرده کـند لعـبت بـی شـرم و حـیا را
مسـتدام است اگـر سـایه زلف تـو بـرخسـار
بـوم دیگـر نـبرد مـیمنت بـال هـما را
هـیچ دانـی چـه لطـیفه است در اینجا کـه نـماید
مـرمر سـینه بـه مـا و بـه تـو هـم نـقره پـارا
یـعنی ای بسـته جـهان چشـم تـو از خـوبی عـالم
چشـم بگشـا و بـبین حکـمت ایـن صـنع خـدا را
نـیست در بـین مـن و دوست حـجابی و بـه چـادر
او کشـد پـرده بـر دیـده آن هـرزه نگـارا
پـرده عـصمتت ای دخـتر زیـبای مسـلمان
بـاید الگـو شـود و مـظهر تـقوا و تـقا را

# نان و آب

چیست این موضوع شهر از آب تاب افتاده است
خلق بهر جرعه آبي در عذاب افتاده است
هر کجا آبی گمان بردم حبابی بود و بس
جز دو چشم خود که در موجش حباب افتاده است
تشنه‌ای میگفت سد هم در برویم وا نکرد
کار این لب تشنه هم در سد باب افتاده است
نانوائی را بگفتم نان چرا کم هست گفت
چون گره در کار آب آسیاب افتاده است
جز دل مجنون و زلف لیلی و چشمان من
هر چه می‌بینی ز تاب و التهاب افتاده است
خانه‌تان آباد باد ای ساکنان کوی آب
کی کنی رحمی بحال ما خراب افتاده است
تا بخواب خوش ببیند شبنمی یا ژاله‌ای
دیده مخمور نرگس هم بخواب افتاده است
شوخ طبعی گفت ازبس گفته‌ام من آب آب
خوب شد یک کم دهان خشکم آب افتاده است
در بهاران یاد آن ایام بارانی بخیر
قدر ما اکنون که از چشم سحاب افتاده است
بسکه گرد تشنگی بنشسته بر لبهای گل
در میان لاله و بلبل حجاب افتاده است
طبع شاداب تو سید در فشاند خلق را
این هم از فیض دو چشم ماست ناب افتاده است

# بــرق

میرود بـرق نـفس سـوخته از مـنزل مـا
مانده خاکستری ازوی که بود حـاصل مـا
برق ای سوخته پـر کـمتر از آن خـفاشی
که زنـد بـال و پـری شب بـدر مـنزل مـا
نـور امـیدی کـه از پـرتو خـورشیدم بـود
آن هم افسرد ز ابری که بشـد حـائل مـا
رفــتنت چـون تک تـازی و ولی آمـدنت
چون خـر لنگ کـه افـتاده درون گـل مـا
آنچه می‌بینم از ایـن آمـدن و رفـتن تـو
سهل حـل مـی‌نشود مسـئله و مشکـل مـا
پرتویرا که در ایـن خـانه تـو سـید بـینی
گرمی آتش دلهاست در ایـن مـحفل مـا

# نانوایی

آن نانوا که چهره کشد در نقاب خویش
روزی رسد که پس دهد آخر حساب خویش
از تکه‌های سوخته و از خمیر خام
بهر من و برشته، برای جناب خویش
یارب که نانوا بصلیبی کشیده باد
داند که چیست قصه نان و شراب خویش
گویم بحال دل که بسوزد در انتظار
ما را کفایت است شراب و کباب خویش
آخر نشد که دفعه‌ای در روز و ماه و سال
راحت خورم نان خودم را به آب خویش
یارب همیشه امت در صف نگاه‌دار
از آتش لهیب تنور و عذاب خویش
آن شاطری که جمله ملازم رکاب بود
اکنون کشیده مشتریان در رکاب خویش
سید گر از گرسنگی خوابش برد چه خوب
نان برشته گشته ببیند بخواب خویش

## دانشگاه آزاد اسلامی مهاباد

بال دانش گر نباشد فکر را پرواز نیست
شعله کی برخیزد ار با یک دمی دمساز نیست
گرچه دانشگاه بسیار است در عالم ولی
همچو دانشگاه اسلامی که انسان ساز نیست
مرغ استعداد را بال و پر تعلیم ده
ورنه مرغان قفس خود قدرت پرواز نیست
تا بکی بلبل کشد بر سینه داغ لاله را
پشت دیوار چمن چون در برویش باز نیست
کاسه صبر من و لب تشنگان لبریز شد
جان چو بر لب میرسد دل جایگاه راز نیست
همت آزادگانی ساخت دانشگاه ما
آفتابی از چراغی روشن این اعجاز نیست
کاروان راه افتد و بانگ جرس آید بگوش
کیست با این نغمه جانسوز هم آواز نیست
گر فلک با ما سر ناسازگاری داشته است
دیگر از این نغمه‌ها سید که کارش ساز نیست

## دانشگاه پیام نور مهاباد

هر آنکه در دل او عشق علم و فرهنگ است
بگوبجان و دل این نغمه بس خوش آهنگ است
از این پیام شکوفا شود چو گل ز نسیم
دلی که مایل و مشتاق علم و فرهنگ است
پیام نور امید است چون فرشته علم
هنوز یک تنه با دیو جهل در جنگ است
کند چو آینه صیقلی ز پرتو خویش
دلی که خود ز جهالت سیاه چون سنگ است
چو ساربان نبرد کاروان ببانگ جرس
بروز حشر جلودار قافله لنگ است
براستی که در این عصر جهل و نادانی
برای مردم دل زندهٔ چو ما ننگ است
فروغ علم چو تابد بساحت دل ما
خود این طلیعه خورشید هفت اورنگ است

# در عزای هیمن

هـر طـرف را ز اشکـهای لاله گـلشن کـرده‌ام
بسکـه بـر خـاک تـو ای استاد شـیون کـرده‌ام
گر زبان خاموش دارم همچو سوسن منع نیست
در عـزای بـلبلی مـن تـرک گـلشن کـرده‌ام
گـریه بـر خـاک تـوام امـروز دل روشـن نکـرد
بـر مـزار چـلچراغـی شـمع روشـن کـرده‌ام
گـل نـیم قـدر تـو دانـم بـاغبان لاله‌ام
داغ را بـر سـینه چـون پیراهـن تـن کـرده‌ام
آتش دل مـی‌جهد چـون اشک از چشـمان مـن
بـهر ایـن آتش فشـان از دیـده روزن کـرده‌ام
اشکـهای تـلخ و روشـن از گـریبانم گـذشت
رنگ رنگ از غـنچه‌ها یکـجا بـدامـن کـرده‌ام
داغ بر دل اشک بر دیده چنان هـم کس نکـرد
آنـچه پـیدا و نـهان در شیونت مـن کـرده‌ام
آنکـه شـمع انـجمن افـروز بـودی مـدتی
در عـزایش سید اکـنون شـمع روشـن کـرده‌ام

# بیاد همین خرداد ٦٧

نه گلشن بی تو خود لطفی دل انگیزانه دارد
نه بلبل بی نوایت نغمه مستانه دارد
نه دل میگیردم بی یاد تو در سینه آرامی
نه جان بی پرتو تو جلوه جانانه دارد
کسان از سنگ و آهن خانه میسازند لیکن او
درون هر دل پر شور و شوقی خانه دارد
بگیتی مرد نام آور فزون فرزانه هم بسیار
ولی شعر ادب ما را یک این فرزانه دارد
بیا و مجمع ما را ببین آشفته و درهم
بهر دل بنگری خود حالت دیوانه دارد
پریشان خاطرند امروز یاران انجمن بینم
ز بی نظمی نشان از طرەی بی شانه دارد
اگر سیلاب اشکم ساحلی جوید دل من هست
زهر جا ره برو بندند خود ویرانه دارد
تو ای با راز دلها آشنا بگرفتی از من دل
که چون با تست با من رنگی از بیگانه دارد
فلک از کجرویهایش هزاران قصه پرورده است
و لیکن قصه او شیوه افسانه دارد
چو شمع از انجمن بیرون رود اشکی بجا ماند
حکایتها ز تلخیهای یک غمخانه دارد
قلم جز رنج و محنت بر بیاض دفترش ننوشت
برسم خود فلک نقشی سیه‌کارانه دارد
بپای شمع اگر پروانه میسوزد عجب نبود
عجب سید که او خاکسترش پروانه دارد

# حلبچه

خود جهان امروز پر گشته ز غوغای دگر
چهره عالم بخود بگرفته سیمای دگر
باز یک پرونده از ظلم و جنایت باز شد
هیروشیمای دگر شد شهری از جای دگر
بر سر شهر حلبچه بمب شیمیایی بریخت
ساخت صدام از جنایت هیروشیمای دگر
جز دل من کز غم این شهر در خون خفته است
نیست ویران تر ازو جایی و ماوای دگر
آخر این خلق مسلمان را بگو تاوان چه بود
سوختی در آتش او را از چه فتوای دگر
انتقام خویش را باید بدست خود گرفت
انتظار خیر نتوان داشت ز ابنای دگر
انتظاری نیست از این مجمع بین الملل
کاین ضعیفان جمله سر دارند در پای دگر
این جنایت کار را امروز سرکوبی کنید
تا جنایت ریشه کن گردد بفردای دگر
باید از نو ساخت در جای همین شهر خراب
از برای این عزیزان شهر زیبای دگر

# صله

مـا کـه خـواهـیم از ایـن مـردم بـازار صـله
عـلت آن است نـخواهـیم ز اغـیار صـله
من که صد شعر فزون ساختم اندر شب عید
احسـنی را نگـرفتم مـن از اشـعار صـله
خون دل خوردم و دود جگـر و نـفت چـراغ
هـمه شب تـا کـه شـود صـبح پـدیدار صـله
لیک دادنـد بـه پـاداش عـمل آنـچه نکـرد
هـدیه‌ها بـیشتر از صـد بـه شـهردار صـله
غـیر خـوبی کـه نـدیدند ز اشـعار ولی
بـد شـود شـعر اگـر کـرد گـرفتار صـله

* * *

جـای در دلهـای مـا دارنـد مـهمانان مـا
خانشان آباد چـون راضـی بـاین ویـرانه‌انـد
خیر مقدم گفتنم امشب به مهمانان خطا است
دوستانی آمدند اینجا کـه صـاحب خـانه‌انـد

# گربه عابد نماز کرد

آنکس که قصد رفتن نجد و حجاز کرد
اول کـویت را هـدف حـرص و آز کـرد
بـر ساحل خلیج چـه خوش آرمیده بـود
آرامشش بـهم زد و از خـواب نـاز کـرد
گـویا بـه نـفت قـبله عـالم نـیاز داشت
مـیخواست زیـن مـقدمه رفـع نـیاز کـرد
اسـرار دل کـه راز نـهان بـود مـدتی
مـغرور و بـی مـلاحظه افشـای راز کـرد
هـر چـند بسته بـود سـر دیگ اغـذیه
آن حـقه بـاز رفت و سـر حـقه باز کـرد
وان بره را که بـهر خـودش دنـبه داشت کشت
وانگـه نـثار گـربه و گـرگ و گـراز کـرد
بـا دشـمنان پـر گـله نـاسازگار مـاند
بـا دوسـتان یـکـدله هـم فـتنه ساز کـرد
اکـنون کـه کـوته است زهـر سـوی دست او
دست نـیاز خـویش بـهر سـو دراز کـرد
بـی عـلم اجـتهاد کـند بـی وضـو نـماز
زیـن گـفته‌انـد گـربه عـابد نـماز کـرد

